## پێشەكی

الحمد لله، أعظَمَ للمتقين العاملين أجورَهم، وشرح بالهدى والخيراتِ صدورَهم،

أشهد أن لا إله إلا الله وحدَه لا شريكَ له، وفّق عبادَه للطاعات وأعان، وأشهد أنّ نبيَّنا محمّدًا عبدُ الله ورسوله خير من علَّمَ أحكامَ الدِّين وأبان، صلّى الله عليه وعلى آله وأصحابِه أهلِ الهدى والإيمان، وعلى التابعين لهم بإيمان وإحسان ما تعاقب الزمان، وسلّم تسليمًا مزيدا.

**اما بعد:**

**مرۆڤی باوەڕدار بەهەشتێكی هەیە لەم دونیایەدا، ئەگەر بێت و بچێتە ناویەوە ئەوە بێگومان دەچێتە بەهەشتێكی تری هەمیشەیی، ئەمیش لە دوای مردن.**

**بەهەشتی ئەم دونیایەش بریتیە لە زیكركردنی پەروەردگاری گەورە و بە دەسەڵات، خودای گەورە ڕێگا گەلێك زۆری داناوە بۆ بەندەكانی تا كامەیان لە توانا دابێت ئەنجامی بدەن و تەكلیفی زۆری لێنەكردوون.**

**خودای بە سۆز و میهرەبان حەزدەكات بەندەكانی ناوی بێنن و یادی بكەن، دەزانی بۆچی؟ تەنها لەبەر ئەوەی بیانخاتە بەهەشتەكەیەوە، تەنانەت ئەم پەروەردگارە مەزنە هیچ منەتێكی بە عیبادەتی ئێمە نیە، بەڵكو ئێمەین موحتاجی ئەوین بۆ دین و ژینمان، بۆ دونیا و قیامەتمان.**

**ئەوەشمان لەیاد نەچێت هەر لە دونیادا بەرهەمی كردەوە چاكەكان و ئەو زیكرانەی ڕۆژانە ئەنجام دەدرێت دەبینرێتەوە، ئەوەتا خودای گەورە دەفەرموێت:** ﴿مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩٧﴾ النحل.

**واتە: ئەوەی كارو كردەوەی چاكەی كردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت لە كاتێكدا بڕوادار بێت، سوێند بە خوا بەژیانێكی كامەران و ئاسوودە لە دنیادا دەیژیێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بەجوانتر دەدەینەوە لەوەی كە ئەوان دەیانكرد.**

**دڵخۆشی زۆر لە گەنجانی ئێستا ڕازیكردنی ڕەگەزی بەرامبەرە و و نێرگلە و كافتریا و كۆڵانە! دواتریش دەچێتە لای مامۆستایەكی ئاینی و شەكوای حاڵی خۆی دەكات! نەفسی تێكچووە، بیر و هۆشی تێكچووە، ژیانی تێكچووە! ئەمە دوای چی؟ دوای چەند ساڵێك لە ڕابواردن و بێ دڵی نەكردنی هەوا و ئارەزووی خۆی، ئێستا هەستدەكات هیچی بەهیچ نەكردووە تەنها دڵی وێران كردووە، بەڵێ ئەوەیە خودای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ١٢٤﴾ طه.

**واتە: ئەوەیش ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی من و پشتی تێ بكات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە كەسانە ژیانێكی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەكوێری حەشری دەكەین.**

**هەندێك لەسوودەكانی زیكر كردن و كردەوە چاكەكان:**

- **ژیانێكی خۆش و ئاسوودە و سەرفرازبوون لە ڕۆژی دواییدا.**
- **نەمانی خەم و خەفەت لە دڵدا و نەمانی قەڵەقی و دوودڵی و كێشە خێزانیەكان....**
- **خۆشەویستی خودای گەورە بۆ ئەو جورە كەسانە.**
- **بەدەست هێنانی پلە و پایەی بەرز لە بەهەشتدا.**
- **بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خودای گەورە.**

- بەدەست هێنانی ڕزق و ڕۆزی و ماڵ و سامانێکی فراوان.
- دەبێتە کەفارەت و سڕینەوەی گوناھـ و تاوانەکان و ڕێك و پێکبوونی کار و بارەکان.
- خودای گەورە بەهۆی ئەو کردەوە چاکانەیان پاداشتیان بۆ زیاد دەکات بە چەندین قات.
- هۆکارە بۆ بەدەست هێنانی ڕەحمەتی خودای گەورە.
- ڕزگاربوون لە کوێرایی دڵ و دەروون و گومڕایی بۆ هیدایەت و ڕووناکی.

وە چەندین سوودی تری ئەم کردەوە چاکانە، کە هەر خوا خۆی پاداشتی ئەم بەندە چاکانەی دەداتەوە.

ئومێدەوارین لە خودای گەورە ڕێنوێنیمان بکات بۆ ڕێگای حەق و بۆ یاد کردنی خۆی و بەگەورەدانانی، زمان و ئەندامەکانمان بخاتە کار بۆ پەرستشی ئەم پەروەردگارە بەڕەحم و میهرەبانە، وە نەمانخاتە ڕیزی بێ ئاگایان و سەر لێشێواوان.

**تێبینیەکی گرنگ:**

ژمارەیەکی کەم لەو فەرموودانەی کە لێرەدا هێناومانن، زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر بەهێزی و لاوازی سەنەدەکەیان، هەیانە بەلاوازیان داناوە، هەشیانە بە بەهێزیان داناوە، مادەم لە نێوان بەهێزی و بێ هێزی دایە و لە باسی (فضائل الأعمال)یشە، ئەوە کارپێکردنی کارێکی چاکە و دەبێتە خاوەن پاداشت ان شاءالله تعالی، هەروەك ئیمامی "احمدی کوڕی حەنبەل دەفەرموێت: هەرکاتێك فەرموودەیەکمان گێڕایەوە لە پێغەمبەرەوە لەبارەی حەڵاڵ و حەڕام، ئەوە سەنەدی وەرگرتنی فەرموودە توندتر دەکەین و زیاتر لێی دەکۆڵینەوە، وە هەرکاتێك فەرموودەیەکمان گێڕایەوە لە پێغەمبەرەوە لەبارەی (فضائل الأعمال) ئەوە کەمێك چاوپۆشی دەکەین لەڕووی سەنەدەوە.

بەڵام شێخی ئەلبانی "بە ڕەحمەت بێت" زۆر بەدواداچوونی بۆ ئەو فەرموودانە کردووە و بە صەحیحی داناون، زانای تریش بە ڕاستیان زانیوە و کاریان پێکردووە.

خودای گەورە هەر خۆی زاناترینە.

ئەوەی لێرە ئامادە کراوە پێی دەوترێت: (فَضَائِل الْأعْمَال)، هەیە بە زمان ئەنجام دەدرێت، هەیە بە دڵ ئەنجام دەدرێت، هەیە بە چاو ئەنجام دەدرێت، یان بە دەست وە بە تەواوی ئەندامەکانی تر ئەنجام دەدرێت.

مرۆڤی باوەڕداری زیندوو یەکێك لەمانەی هەر هەیە تا ئەنجامی بدات.

## پاداشتی سیواک کردن

١- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {السِّواكُ مَطهَرةٌ للفَمِ، مَرْضاةٌ للرَّبِّ}[1].

واتە: سیواك دەم پاك دەكاتەوە، وە هۆی ڕازیبوونی پەروەردگارە لەو کەسەی سیواک دەکات.

## پاداشتی دەستنوێژ

٢- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ القِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الوُضُوءِ فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ}[2].

واتە: ئوممەتی من لە ڕۆژی دواییدا بانگ دەکرێن، نێوچەوان و دەست و پێیان سپییە بەهۆی شوێنەواری دەستنوێژەوە (بەو شوێنەوارە دەناسرێنەوە)، بۆیە هەرکەسێک توانی شوێنی درەوشانەوەکە زیاتر بکات؛ ئەوا با ئەنجامی بدات.

٣- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {مَا مِنْكُم مِّن أحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيَسْبِغُ الوُضُوءَ ثُمَّ يَقولُ: أَشْهَدُ أن لّا إِلَه إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسولُه إِلَّا فُتِحتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمانِيَةُ يَدْخُلُ مِن أَيِّهَا شَاءَ}[3].

[1] رواه البخاري معلقا، والنسائي موصولا(٥) وصححه الألباني.
[2] رواه البخاري (١٣٦) ومسلم (٢٤٦) .
[3] رواه مسلم (٢٣٤).

واتە: هەرکەسێک لە ئێوە دەستنوێژ بگرێت و پاشان بڵێت: (أشهدُ أن لا إلَه إلَّا اللَّهُ وحدَه لا شريكَ لَه وَ أشهدُ أنَّ محمَّدًا عبدُه ورسولُه) ئەوە هەر هەشت دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لەهەرکامیان بیەوێت دەچێتە ژوور.

## پاداشتی دوو ڕەکعەتەکەی دەست نوێژ

٤- پێغەمبەرﷺ لە کاتی نوێژی بەیانی بە بیلالی فەرموو: {يا بِلَالُ! حَدِّثْنِي بأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ في الإسْلَامِ، فإنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بيْنَ يَدَيَّ في الجَنَّةِ. قالَ: ما عَمِلْتُ عَمَلًا أَرْجَى عِندِي: أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طُهُورًا في سَاعَةِ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ إلَّا صَلَّيْتُ بذلكَ الطُّهُورِ ما كُتِبَ لي أَنْ أُصَلِّيَ}[1].

واتە: ئەی بیلال قسەم بۆ بکە بە گەورەترین کردەوەت کە سوودار بووبێت لە ئیسلامدا، چونکە بەڕاستی من ئەمشەو گوێم لە خشەی نەعلەکانت بوو لە بەردەم مندا لە بەهەشتدا، بیلال وتی: هیچ کردەوەیەکم نەکردووە لەئیسلامدا کە ئومێدی سودم پێی هەبێت جگە لەوەی کە هەرکات دەستنوێژێکم تەواو گرتبێت، لەهەر کاتێکی شەو یان ڕۆژدا، بەو دەست نوێژەوە نوێژم کردووە ئەوەندەی خودا بۆی نوسیبم.

---

[1] رواه البخاري(١١٣٩) ومسلم(٢٤٥٨)

## پاداشتی بانگدان و وەڵام دانەوەی

**٥- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن أذَّنَ اثْنَتَيْ عَشرةَ سَنَةً، وَجَبَت لَهُ الْجَنَّةُ، وكُتِب لَهُ بِتَأْذِينِه فِي كُلِّ مَرَّةٍ سِتُّون حَسَنةً، وَبِإقامَتِهِ ثَلاثُون حَسَنةً}[1].

**واتە: هەركەسێک دوازدە ساڵ بانگ بدات، بەهەشتی بۆ واجب دەبێت، وە بۆ هەرجارێک كە بانگ دەدات شەست چاكەی بۆ دەنوسرێت، وە بۆ قامەتەكەشی سی چاكەی بۆ دەنوسرێت.**

**تێبینی: مەبەست لەم دوازدە ساڵە، مەرج نیە هەموو ڕۆژ هەرپێنج نوێژ بانگ بدات، فەرموودەكە گشتیە، تەنانەت ڕۆژێ یەكجاریش بانگ بدات، یان حەفتەی یەكجاریش بانگ بدات، ئەوە (إن شاءالله) پاداشتەكەی بۆ هەیە و بەهەشتی بۆ واجب دەبێت مادەم لەسەری بەردەوامە.**

**بەڵام ئێستا ئەم پاداشتەیان قەتیس كردووە، بەداخەوە لە شارێكی گەورە چەند كەسێكی كەم بۆیان هەیە بانگ بدەن! هەزاران كەس ئەم پاداشتەی لەكیس چووە.**

**٦- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {لاَ يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ المُؤَذِّن جِنٌّ وَلاَ إِنْسٌ وَلاَ شَيْءٌ، إِلَّا شَهِدَ لَهُ يَوْمَ القِيَامَةِ}[2].

**واتە: هەرچی گوێ بیستی بانگبێژ دەبێ لە جنۆكە و مرۆڤ و هەر شتێكی تر، مسۆگەر شایەدی بۆ دەدات لە ڕۆژی دوایی.**

---

[1] السلسلة الصحيحة (٤٢)

[2] رواه البخاري(٦٠٩)

٧- پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رموێت: {مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ. حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ}[1].

واته: هه‌ر كه‌سێک كاتێ گوێی له‌ بانگ ده‌بێ، له‌و كاته‌دا بڵێ: خوایه‌! ئه‌ی په‌روه‌ردگاری ئه‌م بانگه‌وازه‌ ته‌واوه‌و، ئه‌م نوێژه‌ دامه‌زراوه‌، ببه‌خشه‌ به‌ موحه‌ممه‌دﷺ پله‌ی وه‌سیله‌ و (فَضِيلَة)، (بیگه‌یه‌نه‌و) بیبه‌ بۆ ئه‌و شوێنه‌ سوپاسكراوه‌ی كه‌ به‌ڵێنت پێداوه‌. ئه‌وه‌ بێگومان تكاو شه‌فاعه‌تی منی به‌رده‌كه‌وێ له‌ ڕۆژی دوایی.

٨- پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رموێت: {مَن قالَ حِينَ يَسْمَعُ المُؤَذِّنَ: أَشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وحْدَهُ لا شَرِيكَ له، وأنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ ورَسولُهُ، رَضِيتُ باللَّهِ رَبًّا وبِمُحَمَّدٍ رَسولًا، وبالإسْلَامِ دِينًا، غُفِرَ له ذَنْبُهُ}[2].

واته: هه‌ركه‌سێک كاتێ گوێبیستی بانگده‌ر بوو بانگی ده‌دا و بڵێت: (أشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وحْدَهُ لا شَرِيكَ له، وأنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ ورَسولُهُ، رَضِيتُ باللَّهِ رَبًّا وبِمُحَمَّدٍ رَسولًا، وبالإسْلَامِ دِينًا)، ئه‌وه‌ له‌ گوناهه‌كانی ده‌بوردرێت.

تێبینی: ئه‌م زیكره‌ چ له‌ كۆتایی بانگ بخوێنی، چ له‌ دوای ته‌واوبوونی شه‌هاده‌ته‌ین بخوێنی هه‌ر دروسته‌، چونكه‌ زانایان جیاوازیان هه‌یه‌ له‌باره‌ی كاتی زیكره‌كه‌، به‌ڵام ڕای دروست هه‌روه‌ک ئیمامی نه‌وه‌وی باسی ده‌كات ئه‌وه‌یه‌ كه‌ له‌ دوای ته‌واو بوونی شه‌هاده‌ته‌ین ئه‌م زیكره‌ ده‌كرێت، ئه‌گه‌رچی دوای ته‌واوبوونی بانگه‌كه‌ش هه‌ر دروسته‌.(والله أعلم).

---

[1] رواه البخاري(٦١٤)

[2] رواه مسلم(٣٨٦)

## نوێژی بە کۆمەڵ

**٩- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ وَرَاحَ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُ نُزُلَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، كُلَّمَا غَدَا أَوْ رَاحَ}[1].

**واتە: هەر کەسێک بچێت بۆ مزگەوت و بگەڕێتەوە، خوا شوێنێکی بۆ ئامادە دەکات لە بەهەشت، هەر جارێک کە دەچێ یان دەگەڕێتەوە (بۆ نوێژی کۆمەڵ).**

**١٠- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن خَرَجَ مِن بَيتِه مُتَطهِّرًا إلى صَلاةٍ مَكتوبةٍ، فأجْرُه كأجْرِ الحاجِّ المُحرِمِ}[2].

**واتە: هەرکەسێک بەدەست نوێژەوە لەماڵ دەربچێت بۆ نوێژێکی واجب، ئەوە پاداشتەکەی وەکو حاجیەك وایە کە ئیحرامی بەستووە.**

**١١- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {صَلَاةُ الرَّجُلِ في الجَمَاعَةِ تُضَعَّفُ علَى صَلَاتِهِ في بَيْتِهِ، وفي سُوقِهِ، خَمْسًا وعِشْرِينَ ضِعْفًا، وذلكَ أنَّهُ: إذَا تَوَضَّأَ، فأحْسَنَ الوُضُوءَ، ثُمَّ خَرَجَ إلى المَسْجِدِ، لا يُخْرِجُهُ إلَّا الصَّلَاةُ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً، إلَّا رُفِعَتْ له بهَا دَرَجَةٌ، وحُطَّ عنْه بهَا خَطِيئَةٌ، فَإِذَا صَلَّى، لَمْ تَزَلِ المَلَائِكَةُ تُصَلِّي عليه، ما دَامَ في مُصَلَّاهُ: اللَّهُمَّ صَلِّ عليه، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، ولَا يَزَالُ أحَدُكُمْ في صَلَاةٍ ما انْتَظَرَ الصَّلَاةَ}[3].

**واتە: نوێژی کەسێك کە بە کۆمەڵ دەیکات، بیست و پێنج پلە خێر و پاداشتی زیاترە، لە نوێژی ماڵەوە و بازاڕی کە بەتەنیا دەیکات، ئەمەش بەوە دەبێت**

---

[1] رواه البخاري(٦٦٢) ومسلم(٦٦٩)

[2] صحيح الترغيب(٦٧٥)

[3] رواه البخاري(٦٤٧) ومسلم(٦٤٩)

هەركاتێك دەستنوێژێكی جوان بگرێت، پاشان دەربچێت بۆ نوێژ، كە جگە لە نوێژ بۆ هیچ شتێكی تر دەرنەچووبێت، هەر هەنگاوێك دەنێت ئەوە پلەیەك پێی بەرز دەكرێتەوە، وە خراپەیەكیشی لەسەر لادەچێت، هەركاتێك كە نوێژی كرد، ئەوە فریشتەكان بەردەوام داوای لێخۆشبوونی بۆ دەكەن تا ئەو كەسە لەشوێنی خۆی دەمێنێتەوە، دەڵێن: خودایە لێی خۆشبە و ڕەحمی پێبكە.

وە هەر یەكێكتان لە نوێژدان مادەم چاوەڕوانی نوێژ دەكەن.

١٢- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {من صَلّى الغَداةَ في جَماعَةٍ، ثُمّ قَعَدَ يَذكُرُ اللّهَ حتى تَطْلُعَ الشَّمسُ، ثُمَّ صلّى رَكْعَتَين، كانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حجَّةٍ وعُمرةٍ، تامَّةٍ تامَّةٍ تامَّةٍ}[1].

واتە: هەركەسێک نوێژی بەیانی بە جەماعەت بكات، پاشان دابنیشێت تا خۆر هەڵدێت، پاشان دوو ڕەكعەت نوێژی سوننەت بكات، پاداشتەكەی وەكو حەج و عومرەیەكی تەواو تەواو وایە.

تێبینی: مەبەستی فەرموودەكە ئەوەیە كە پاداشتەكەی وەكو حەج و عومرەكردن وایە، نەک كردنی ئەم كارەی جێگای حەجی واجب بگرێتەوە.

ئەو دوو ڕەكعەتەی كە لەفەرموودەدا هاتووە كە لە دوای خۆر هەڵاتن دەكرێت، نوێژی چێشتەنگاوە(ضحى)، شتێک نیە جیاواز بێت، یان پێی بوترێت نوێژی(شروق)، ئەمە ڕای زۆر لە زانایانە، چونكە فەرموودەی تر هەیە پشتگیری ئەمە دەكەن.

ئەگەرچی هەندێ لە زانایان ئەم فەرموودەیان بە لاواز داناوە، بەڵام شێخی ئەلبانی بە حەسەنی داناوە.

ئەگەر ئەم فەرموودەیەش لاواز بێت، بەڵام لە فەرموودەی ڕاستدا هاتووە كە پێغەمبەرﷺ دانیشتووە لەدوای نوێژی بەیانی تا خۆر هەڵاتووە، ئەوەیشی بەم نیەتە دەمێنێتەوە (ان شاءالله) پاداشتی بۆ هەیە.

---

[1] اسناده حسن: السلسلة الصحيحة(٣٤٠٣)

دەكرێت فەرموودەكە بۆ پیاوان بێت، چونكە پیاوەكان موكەلەفی نوێژی جەماعەتن نەک ئافرەتان، بەڵام ئەگەر ئافرەتیش بمێنێتەوە لەمزگەوت تا دوو ڕەكعەت نوێژەكەش دەكات، ئەوە بێگومان ئەویش ئەم پاداشتەی بۆ هەیە ان شاءالله تعالى. بێگومان ماڵی ئافرەت چاكترین شوێنە بۆ نوێژكردن.

**١٣- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَنْ صَلّى الْعِشاءَ في جَماعةٍ فَكَأنَّما قامَ نِصْفَ اللّيلِ، وَمَنْ صَلّى الصُّبحَ في جَماعةٍ فَكَأنَّما صَلّى اللَّيلَ كُلَّهُ}[1].

**واتە: هەركەسێك نوێژی عیشا بە جەماعەت بكات، وەك ئەوە وایە نیوەی شەو شەونوێژی كردبێت، وە هەركەسێك نوێژی بەیانیش بكات بەجەماعەت، وەك ئەوە وایە تەواوی شەو شەونوێژی كردبێت.**

## ئەو كەسەی دەچێت بۆ نوێژی جەماعەت
## بەڵام بینی نوێژی جەماعەت تەواو بووە

**١٤- پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت:** {مَن توضَّأَ فأحسَنَ وضوءَهُ ثمَّ راحَ فَوَجدَ النَّاسَ قد صلَّوا، أعطاهُ اللَّهُ عزَّ وجلَّ مثلَ أجرِ مَن صَلَّاها وحضَرَها، لا ينقَصُ ذلِكَ مِن أجورِهم شَيْئًا}[2].

**واتە: هەركەس دەستنوێژ بگرێت بە چاكترین شێوە، پاشان دەربچێت بە مەبەستی چوونە مزگەوت، ببینێ خەڵكی نوێژیان تەواوكردووە، خودای گەورە وەكو**

[1] رواه مسلم(٦٥٦)

[2] رواه أبو داود(٥٦٤) والنسائي(٨٥٥) وأحمد، وصححه الألباني في صحيح ابي داود.

پاداشتی ئەوانەی بۆ دەنوسێ کە ئامادەبوون(لە نوێژەکە)، بێ ئەوەی هیچیش لەپاداشتی ئەوان کەم بێتەوە.

## هەرکەسێک ئامینەکەی هاوتا بێت لەگەڵ ئامین کردنی فریشتەکان

١٥- پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: {إذا قالَ الإمامُ: {غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ} [الفاتحة:٧] فَقُولوا آمِينَ، فمَن وافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ المَلائِكَةِ غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ مِن ذَنْبِهِ}[1].

واتە: ئەگەر ئیمام وتی (ئامین)؛ ئەوا ئێوەش بڵێن (ئامین)، هەرکەسێک وتنی (ئامین)ەکەی لەگەڵ وتنی (ئامین)ی فریشتنەکان بێت؛ ئەوا خوای گەورە لە هەموو تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێت.

## پاداشتی چوون بۆ وتار و نوێژی هەینی

١٦- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {مَنْ غسَّلَ يومَ الْجُمُعَةِ واغْتَسَل، ثُمَّ بَكَّرَ وَابْتَكَرَ، وَمَشَى وَلَم يَرْكَبْ، وَدَنَا مِنَ الْإِمَامِ، وَاسْتَمَعَ، وَأَنصَت، وَلَم يَلْغُ، كانَ لَهُ بِكلِّ خطْوَةٍ يَخْطُوهَا مِن بَيْتِهِ إِلَى الْمَسْجِدِ، عَمَلُ سَنَةٍ، أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا}[2].

---

[1] رواه البخاري(٤٤٧٥) ومسلم(٤١٠)

[2] صحيح الجامع(٦٤٠٥).

## كردنی سوننەتی ڕەواتیب

١٧- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {مَن ثَابرَ على ثِنْتي عَشْرةَ ركعةً في اليَومِ و اللَّيلةِ دَخلَ الجنَّةَ: أربعًا قَبلَ الظُّهْرِ ، و ركعَتينِ بَعدَها ، و ركعَتينِ بعدَ المغرِبِ ، و ركعَتينِ بعدَ العشاءِ، و ركعَتينِ قبلَ الفَجرِ}[1].

واته: هەركەسێک ئارام بگرێ و بەردەوام بێت لەسەر كردنی دوازدە ڕەكعەت لە ڕۆژ و شەودا، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە، ئەوانیش: چوار ڕكات پێش نیوەڕۆ و دوو ڕكات لەدوایەوە و دوو ڕكات دوای مەغریب و دوو ڕكات دوای عیشا و دوو ڕكات پێش بەیانی .

## دوو ڕەكعەتی پێش نوێژی بەیانی

١٨- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:{رَكْعَتا الفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيا وَما فِيها}[2].

واته : دوو ڕەكعەتی پێش نوێژی بەیانی باشترە لەدونیا و ئەوەش كە تیایدایەتی.

---

[1] رواه الترمذي(٤٠٤) والنسائي(١٧٩٤) وابن ماجة(١١٤٠) وصححه الألباني في صحيح الجامع(٦١٨٣)

[2] رواه مسلم(٧٢٥)

## كرنی چوار ڕەكعەت پێش نوێژی نیوەڕۆ
## چوار ڕەكعەتیش لەدوایەوە

**١٩-** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {مَنْ حَافَظَ عَلَى أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعٍ بَعْدَهَا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ}[1] .

واتە: هەركەسێک پارێزگاری بكات لە كردنی چوار ڕەكعەت پێش نوێژی نیوەڕۆ و چوار ڕەكعەتیش لەدوایەوە، ئەوە خودای گەورە ئەو كەسە حەڕام دەكات لەسەر ئاگر(نایسوتێنێت، دەیپارێزێت).

## كردنی چوار ڕەكعەت پێش نوێژی عەسر

**٢٠-** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {رَحِمَ اللَّهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعًا}[2] .

واتە: ڕەحمەتی خودا لەو كەسەی چوار ڕەكعەت پێش نوێژی عەسر دەكات.

---

[1] حسن: رواه أبو داود(١٢٦٩) والترمذي(٤٢٨) وحسنه، والنسائي(١٨١٦) وصححه الألباني.

[2] رواه أبو داود(١٢٧٣) والترمذي(٤٣٠ ) وحسنه، وصححه ابن حبان، وقال الشيخ أحمد شاكر رحمه الله: اسناده صحيح كما في تعليقه على مسند أحمد(٥/٣٢٥) وحسنه أيضا شعيب الأرناؤوط رحمه الله كما في تعليقه على "ابن حبان" (٦/٢٠٦)، وحسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب ٣٨٢/١.

## دروستكردنی مزگەوت

**٢١- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَنْ بَنَى مَسْجِدًا، يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللَّهِ، بَنَى اللَّهُ لَهُ مِثْلَهُ فِي الجَنَّةِ}[1] .

**واتە: هەر كەسێک مزگەوتێكی دروست كرد، بۆ ڕەزامەندی خوا، لە بەهەشتدا خودای گەورە خانووێكی وەک ئەوی بۆ دروست دەكات.**

## نوێژكردن لە مزگەوتی ئەقسا(الأقصَى)

**٢٢- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {لَمَّا فَرَغَ سُلَيْمانُ بنُ داودَ "عَلَيْهِما السَّلامُ" مِن بناءِ بيتِ الْمَقْدِسِ سَأَلَ اللَّهَ عزَّ وجلَّ ثلاثًا: أن يُؤتيَه حُكمًا يُصادِفُ حُكمَه، ومُلكًا لا يَنْبَغي لِأَحدٍ مِّن بَعْدِه، وأنَّه لا يَأْتي هذا المسجدَ أحدٌ لا يُريدُ إلَّا الصَّلاةَ فيه إلَّا خَرَجَ مِن ذُنوبِه كَيَوْمِ ولدَتْه أمُّه، فقال رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم: أمَّا اثنتيْن فَقَد أُعْطِيهما وَأرجو أن يَكونَ قَد أُعْطِيَ الثَّالثةَ}[2].

**واتە: كاتێک كە سولەیمانی كوڕی داود(سەلامی خودایان لەسەر بێت) لە دروستكردنی (بیت المقدس) بوویەوە، سێ داواكاری خواست لە خودای گەورە: حوكم و بڕیارێك كە ڕێك بێت لەگەڵ حوكمی خودای گەورە، وە موڵک و دەسەڵاتێک كە جگە لە ئەو نەیدات بەكەسی تر لەدوای ئەو، وە هەركەس سەردانی ئەو مزگەوتەی كرد و تەنها بە مەبەستی ئەوەی كە نوێژی تێدا بكات، گوناهەكانی**

---

[1] رواه الخاري(٤١٠).

[2] رواه ابن ماجة(١٤٠٨) وابن خزيمة(١٣٣٤) وصححه الألباني في صحيح الجامع (٢٠٩٠).

هەڵوەرێن وەکو ئەو ڕۆژەی کە تێیدا لەدایک بووە، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دوو داواکاری سەرەتای پێی بەخشران، وە تکام وایە سێهەمیشیانی پێبەخشرابێت.

## نوێژکردن لە مزگەوتی قوباء

٢٣- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {الصَّلاةُ في مسْجدِ قُبَاءَ كَعُمْرة}[1].

واتە: نوێژ کردن لە مزگەوتی قوباء پاداشتی وەکو کردنی عومرەیەك وایە.

تێبینی: مزگەوتی قوباء یەکەم مزگەوتە کە لە ئیسلامدا دروست کراوە، کە پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، یەکەم کاری دروستکردنی ئەم مزگەوتەبوو و خۆی بەشداری دروستکردنی کردووە، ئەم مزگەوتە دەکەوێتە باشووری شاری مەدینە، وە پێنج کیلۆمەتر لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺـەوە دوورە، دووەم گەورەترین مزگەوتی مەدینەیە دوای مزگەوتی پێغەمبەرﷺ، بەهۆی نزیکبوونی مزگەوتەکە لەبیرێکەوە بەناوی قوبا مزگەوتەکەش ناونراوە مزگەوتی قوبا.

## نوێژکردن لە مزگەوتی پێغەمبەرﷺ و مزگەوتی حەڕام

٢٤- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {صَلاةٌ فِي مَسْجِدي أَفْضَلُ مِن أَلْفِ صَلاةٍ فِيما سِوَاه إلّا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ، وَصَلاةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرامِ أَفْضَلُ مِن مِّائَةِ أَلْفِ صَلاةٍ فِيما سِوَاه}[2].

واتە: نوێژێک لەو مزگەوتەی من(مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە مەدینە)، خێری زیاترە لە هەزار نوێژ بەراورد بە مزگەوتەکانی تر، تەنها مزگەوتی(الحرام -

---

[1] رواه الترمذي(٣٢٤) وقال حديث حسن غريب، وصححه الألباني.

[2] صحيح الترغيب(١١٧٣).

كەعبە)نەبێت كە لە مەككەیە، چونكە هەر نوێژێک لەم مزگەوتە بە سەد هەزار نوێژە بە بەراورد بە مزگەوتەكانی تر.

## پاداشتی زیكری كاتی خەوتن

**٢٥-** بەڕائی كوڕی عازب دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: {...إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ، فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأيْمَنِ، ثُمَّ قُلْ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وجْهِي إلَيْكَ، وفَوَّضْتُ أمْرِي إلَيْكَ، وأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إلَيْكَ، رَغْبَةً ورَهْبَةً إلَيْكَ، لا مَلْجَأَ ولَا مَنْجَا مِنْكَ إلَّا إلَيْكَ، اللَّهُمَّ آمَنْتُ بكِتَابِكَ الذي أنْزَلْتَ، وبِنَبِيِّكَ الذي أرْسَلْتَ، فإنْ مُتَّ مِن لَيْلَتِكَ، فأنْتَ علَى الفِطْرَةِ، واجْعَلْهُنَّ آخِرَ ما تَتَكَلَّمُ بهِ}[1].

واتە: هەركاتێک ویستت بچیتە جێگات، ئینجا دەستنوێژ بگریت هەروەک چۆن دەست نوێژ دەگریت بۆ نوێژ، پاشان بڵێ (اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وجْهِي إلَيْكَ، وفَوَّضْتُ أمْرِي إلَيْكَ، وأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إلَيْكَ، رَغْبَةً ورَهْبَةً إلَيْكَ، لا مَلْجَأَ ولَا مَنْجَا مِنْكَ إلَّا إلَيْكَ، اللَّهُمَّ آمَنْتُ بكِتَابِكَ الذي أنْزَلْتَ، وبِنَبِيِّكَ الذي أرْسَلْتَ) ئەگەر لەم شەوەدا مردیت ئەوە لەسەر فیترەتی ئیسلام مردوویت(واتە لەسەر تەوحید مردوویت)، وە ئەم دوعایە بیكە كۆتا قسەت كەدەیڵێی.

[1] رواه مسلم(٢٣٤).

**٢٦- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن قال إذا أوى إلى فِراشِه: الحمدُ للَّهِ الَّذي كَفاني وَآواني. الْحَمْدُ للّه الذي أطْعَمَني وَسَقاني. الحمدُ للّهِ الَّذي مَنَّ عليَّ وأفضلَ، اللّهُمَّ ! إنِّي أَسْأَلُك بِعِزَّتِك أن تُنَجِّيَني منَ النَّارِ. فقد حمِدَ اللهَ بجميعِ مَحامِدِ الخَلْقِ كلِّهم}[1].

**واتە: هەرکەسێک چووە جێگاکەی و ئەم دوعایەی خوێند: (الحمدُ لله الذي كفَاني وآواني، الحمدُ لله الذي أطعمَني وسقاني، الحمدُ لله الذي منَّ عليَّ وأفضلَ، اللهمَّ ! إني أسألُك بعزَّتِك أن تُنَجِّيَني من النارِ) ئەوە سوپاس و ستایشی خودای گەورەی بەجێگەیاندووە بەهەموو جۆرە سوپاس و ستایشێک کە دروستکراوەکان سوپاسی دەکەن.**

## گرتنی یەک ڕۆژوو لە پێناو خودای گەورە

**٢٧- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن صامَ يَوْمًا في سَبيلِ اللَّهِ، بَعَّدَ اللَّهُ وجْهَهُ عَنِ النّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا}[2].

**واتە: هەر کەسێک یەک ڕۆژ بەڕۆژوو بێ بە مەبەستی ڕەزامەندی خوا، خوا حەفتا پایز ڕووخساری لە ئاگری دۆزەخ دووردەخاتەوە.**

**تێبینی: هەندێک لە زانایان واتای ئەم فەرموودەیە ئاوا لێکی دەدەنەوە: هەرکەسێک یەک ڕۆژ بەڕۆژووبێت و لە جیهادیش بێت لەپێناو خودای گەورە، واتە هەم بە ڕۆژوو بێت و هەمیش لە جیهاد دابێت دژی بێباوەڕان لەپێناو خودای گەورە، ئەوکات خودای گەورە حەفتا ساڵ ئەو کەسە لە ئاگری جەهەننەم دوور دەخاتەوە.**

[1] اسناده صحيح، السلسلة الصحيحة(٣٤٤٤).
[2] البخاري(٢٨٤٠) و مسلم(١١٥٣).

بەڵام هەندێکی تر لە زانایان پێیان وایە ئەم فەرموودەیە گشتیە و مەبەست لەوەیە کە بە ئیخلاسەوە و نیەتێکی پاکەوە بۆخودا بگرێت، جا لە جیهاد بێت یان لە ماڵ یان لەهەر شوێنێک، ئەوە ئەم پاداشتەی بۆ هەیە، بەڵکو ئەوەی لە جیهاد دایە باشترە ڕۆژوو بشکێنێت، چونکە فەرمانی پێکراوە، ئەگەرچی پێبوونیشی دروستە، بەڵام نەگرتنی ڕۆژوو لەجەنگدا چاکترە، هەروەک پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا بەهاوەڵانی فەرموو: (إِنَّكُمْ قَدْ دَنَوْتُمْ مِنْ عَدُوِّكُمْ وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ)رواه مسلم (١١٢٠).

واتە: ئێوە لە دوژمنتان نزیک بوونەتەوە، ڕۆژوو شکاندنتان بەهێزتر و چالاکترتان دەکات(بەرامبەر دوژمن).

کەواتە دیارە ئەم پاداشتەی یەک ڕۆژ بەڕۆژووبوون حەفتا ساڵ خاوەنەکەی لە جەهەننەم دوور دەخاتەوە، بۆ هەرکەسێکە کە بە نیەتێکی پاکەوە بۆ خودای گەورە بگرێت و هیچ ڕیایی تێدا نەبێت.

والله تعالى أعلم.

## ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان بەئیمانەوە

**٢٨- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ}[1].

**واتە: هەر کەسێک ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ بە بڕوا پێ بوونەوەو بە چاوەڕوانی پاداشتەوە، ئەوە خودای گەورە لە گوناهی ڕابردووی خۆش دەبێ.**

[1] متفق عليه، رواه البخاري(٢٠١٤) ومسلم (٧٦٠).

## گەورەیی شەوی قەدر

**٢٩- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن قامَ لَيْلَةَ القَدْرِ إيمانًا واحْتِسابًا، غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ مِن ذَنْبِهِ}[1].

**واتە: هەر کەسێک شەوی قەدر زیندوو بکاتەوە و شەونوێژ بکات و، بە بڕوا پێ بوون و چاوەڕوانی پاداشتەوە، لە گوناهی ڕابردووی دەبوردرێت.**

## ڕۆژووی شەشەڵان

**٣٠- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** {مَن صامَ رَمَضانَ ثُمَّ أتْبَعَهُ سِتًّا مِن شَوّالٍ، كانَ كَصِيامِ الدَّهْرِ}[2].

**واتە: هەرکەسێک مانگی ڕەمەزان بگرێت و پاشان شەش ڕۆژوو لە مانگی شەوال بگرێت بەدوایدا، وەک ئەوە وایە تەواوی ساڵ ڕۆژووی گرتبێت.**

**٣١- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {من فطَّر صائمًا كان له مثلُ أجرِه، غيرَ أنه لا ينقصَ من أجرِ الصائمِ شيئًا}[3].

---

[1] البخاري(٢٠١٤) و مسلم(٧٦٠).

[2] رواه مسلم(١١٦٤).

[3] صحيح الجامع(٦٤١٥).

واتە: هەرکەسێک خواردنی ڕۆژووشکاندن ببەخشێت بە ڕۆژووگرێک؛ ئەوا هەمان پاداشتی ڕۆژووگرەکەی بۆ هەیە بە بێ ئەوەی هیچ شتێک لە پاداشتی ڕۆژووگرەکە کەم بکات.

## عومرەکردن لە ڕەمەزاندا

**٣٢- پێغەمبەرﷺ دەفەرمویێت:** {فَعُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَقْضِي حَجَّةً - أَوْ حَجَّةً مَعِي}[1].

واتە: عومرەکردن لە ڕەمەزاندا وەکو ئەوە وایە حەجێکت کردبێت، یان حەجێکت لەگەڵ مندا کردبێت.

تێبینی: ئەم فەرموودەیە زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر پاداشتەکەی، ئایا بۆ هەموو کەسێکە یان بۆ کەسانێکی دیاری کراوە؟

سێ بۆچوون هەیە، بەکورتی: یەکەمیان: ئەم پاداشتە بۆ ئەو ئافرەتەیە کە هاتە لای پێغەمبەرﷺ و نەیتوانی بچێتە حەج لەگەڵ پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەریشﷺ پێی فەرموو: لە ڕەمەزاندا عومرە بکە، چونکە عومرەکردن لە ڕەمەزاندا وەکو ئەوە وایە حەجێکت کردبێت یان حەجێکت لەگەڵ من کردبێت.

دووەمیان: ئەم پاداشتە بۆ کەسێکە کە نیەتی حەج بێنێت، بەڵام نەتوانێت بچێت بۆ حەج، ئەوە عومرەکردنی لە ڕەمەزاندا وەکو حەجێک وایە کە لەگەڵ پێغەمبەرﷺی کردبێت.

سێیەمیان: کە ئەمە ڕای زانایانی هەر چوار مەزهەبە و جگە لەوانیش، کە پێیان وایە ئەم پاداشتە گشتیە بۆ هەرکەسێکە کە لە ڕەمەزاندا عومرە بکات و وەکو ئەوەی وایە حەجێکی کردبێت، تایبەتیش نیە بەهیچ کەسێکەوە.

ئەم بۆچوونەی کۆتایی نزیکترە لە ڕاستی، کە ئەمە لای زانایان زۆر ڕوون و ئاشکرایە. الشیخ محمد صالح المنجد، السؤال (١٠٤٩٢٦).

(رد المحتار" (٤٧٣/٢) ، "مواهب الجليل" (٢٩/٣) ، "المجموع" (١٣٨/٧) ، "المغني" (٩١/٣) ، "الموسوعة الفقهية" (١٤٤/٢).

---

[1] رواه البخاري(١٨٦٣) ومسلم (١٢٥٦).

## پاداشتی حەج و عومرە

**٣٣- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {العُمْرَةُ إِلَى العُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالحَجُّ المَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الجَنَّةُ}[1].

**واتە: عومرە بۆ عومرە کەفارەتی گوناهی نێوانیانن، حەجی قەبووڵکراو هیچ پاداشتێکی نیە جگە لە بەهەشت.**

## پاداشتی تەلبیە کردن(لبيك اللهم لبيك...)لە حەجدا

**٣٤- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {ما من مُلَبٍّ يلبِّي إلَّا لبَّى ما عن يمينِهِ وشمالِهِ من حَجَرٍ أو شجَرٍ أو مدرٍ حتَّى تنقطعَ الأرضُ من هاهنا وَهاهنا}[2].

**واتە: هەرکەسێک کە تەلبیە دەکات ئەوە لەوکاتەدا هەرچی لەلای ڕاست و چەپیەتی لە بەرد و دار و کەستە قوڕ و هەتا کۆتایی زەوی، هەمووی لەگەڵ ئەو تەلبیە دەکات(لە خۆر هەڵات بۆ خۆر ئاوا).**

---

[1] متفق عليه؛ أخرجه البخاري (١٧٧٣)، ومسلم (١٣٤٩).

[2] رواه ابن ماجة(٢٩٢١)، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب(١١٣٤).

## تەواف كردن

**٣٥-** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {مَن طافَ بالبيتِ وصلّى رَكعتَينِ كانَ كعتقِ رقبةٍ}[1].

واتە: هەركەسێک تەوافی بەیت(كەعبە) بكات و دوو ڕكات نوێژیش بكات، وەک ئەوە وایە بەندەیەكی ئازاد كردبێت.

## دە ڕۆژی یەكەمی (مانگی ذي الحجة)

**٣٦-** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {ما مِنْ أيامٍ العملُ الصالحُ فيهنَّ أحبُّ إلى اللهِ مِنْ هذهِ الأيامِ العشرِ، فقالوا يا رسولَ اللهِ ! ولا الجهادُ في سبيلِ اللهِ؟ فقال رسولُ اللهِ ﷺ: ولا الجهادُ في سبيلِ اللهِ، إلا رجلٌ خرجَ بنفسِهِ ومالِهِ فلمْ يرجعْ مِنْ ذلكَ بشيءٍ}[2].

واتە: هیچ ڕۆژێک نییە كە ئەنجامدانی كردەوەی چاک خۆشەویستر بێت لای خوای گەورە وەكو ئەم ڕۆژانە( مەبەست دە ڕۆژی یەكەمی (مانگی ذي الحجة) یە، ووترا: ئەی پێغەمبەری خودا، تەنانەت جیهاد و تێكۆشانیش لە پێناو خوای گەورە لەمە گەورەتر نیە؟ فەرمووی: بەڵێ، تەنانەت جیهاد وتێكۆشانیش لە پێناو خوای گەورە، جگە لە پیاوێک نەبێت كە بەخۆیی و هەموو ماڵی دەرچوو بێت، و بە هیچ شتێک لەوانە نەگەڕابێتەوە(ئەوكات پاداشتی ئەو كەسە زۆرترە).

---

[1] صحيح ابن ماجة(٢٤١١).

[2] صحيح الترمذي(٧٥٧).

## ڕۆژووی عەرەفە

**٣٧-** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ، أَحْتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ، وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ}[1].

واتە: ڕۆژی عەرەفە ئومێدم وایە بەخوا كە ببێت بە كەفارەتی (تاوانی) ساڵی ڕابردوو، ساڵی داهاتووش.

## ڕۆژووی عاشورا

**٣٨-** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {صِيَامُ يَومِ عَاشُورَاءَ، أَحْتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ}[(2)].

واتە: داوام وایە ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا ببێتە هۆكاری سڕینەوەی یەك ساڵی تاوانی ڕابردوو.

## گەورەیی قورئان خوێندن

**٣٩-** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {مَن قَرَأَ حَرْفًا مِّنْ كِتابِ اللهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنةٌ، والْحَسَنةُ بِعَشرِ أَمْثالِها لا أَقولُ ﴿ألم﴾ حرفٌ ولكن ألفٌ حرفٌ ولامٌ حرفٌ وميمٌ حرفٌ}[3].

---

(1) رواه مسلم(١١٦٢).

(2) صحيح مسلم(١١٦٢).

3 صحيح الترغيب(1416).

واته: ههرکهسێک پیتێک له کتێبی خودای گهوره(قورئان)بخوێنێتهوه، ئهوه چاکهیهکی بۆ ههیه، وه چاکهش ههریهک به دهیه، من نالێم(ألم) ههمووی پیتێکه، بهڵکو(أ) بهتهنیا پیتێکه و ، (ل) پیتێکه و، (م) پیتێکه. (واته بهم سێ پیته 30 چاکهت بۆ دهنوسرێت).

٤٠- پێغهمبهر ﷺ دهفهرموێت: {أَفلا يَغْدُو أَحَدُكُمْ إلى المَسْجِدِ فَيَعْلَمُ، أَوْ يَقْرَأُ آيَتَيْنِ مِن كِتابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، خَيْرٌ له مِن ناقَتَيْنِ، وَثَلاثٌ خَيْرٌ له مِن ثَلاثٍ، وَأَرْبَعٌ خَيْرٌ له مِن أَرْبَعٍ، وَمِنْ أَعْدادِهِنَّ مِنَ الإبِلِ}[1].

واته: ئهی ناکرێت ههریهکێک لهئێوه سهر له بهیانی بڕوات بۆ مزگهوت و دوو ئایهت لهقورئان فێرببێت یان بخوێنێت، که بۆی باشتره له دوو وشتری مێ، وه سێ ئایهت باشتره بۆی له سێ وشتر، وه چواریش بۆی باشتره له چوار وشتر، ئیتر بهپێی ژمارهی ئایهتهکان بهرامبهر بوونی وشتر.

٤١- پێغهمبهر ﷺ دهفهرموێت: {مَن قرأَ بمِئةِ آيةٍ في لَيلةٍ، كُتِب له قُنوتُ لَيلةٍ}[2].

واته: ههرکهسێک سهد ئایهت بخوێنێت له شهوێکدا، ئهوه پاداشتی شهونوێژی شهوێکی بۆ دهنوسرێت.

---

[1] صحيح مسلم(٨٠٣).

[2] صحيح الجامع(٦٤٦٨).

## گەورەترین سورەت لە قورئاندا

**٤٢- ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللا(ڕەزای خودای لێبێت) دەڵێت:** {كُنْتُ أُصَلِّي فِي المَسْجِدِ، فَدَعَانِي رَسولُ اللَّهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فَلَمْ أُجِبْهُ، فَقُلتُ: يا رَسولَ اللَّهِ، إنِّي كُنْتُ أُصَلِّي، فقالَ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ: {اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ} [الأنفال: ٢٤]؟ ثُمَّ قالَ لِي: لَأُعَلِّمَنَّكَ سُورَةً هي أعْظَمُ السُّوَرِ في القُرْآنِ قَبْلَ أنْ تَخْرُجَ مِنَ المَسْجِدِ. ثُمَّ أخَذَ بيَدِي، فَلَمَّا أرادَ أنْ يَخْرُجَ، قُلتُ له: أَلَمْ تَقُلْ: لَأُعَلِّمَنَّكَ سُورَةً هي أعْظَمُ سُورَةٍ في القُرْآنِ؟ قالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) هي السَّبْعُ المَثانِي، والقُرْآنُ العَظِيمُ الذي أُوتِيتُهُ}[1].

**واتە: جارێک لە مزگەوت نوێژم دەکرد، لەناو نوێژەکەدا پێغەمبەرﷺ بانگی کردم، وەڵامم نەدایەوە، کە نوێژم تەواوکرد چوومە خزمەتی، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من نوێژم دەکرد بۆیە وەڵامم نەدایەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی خودای گەورە نافەرموێت:** {اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ} [الأنفال: ٢٤]**؟.**

**پاشان فەرمووی: بەرلەوەی لەمزگەوت بچیتە دەرەوە سورەتێکت فێردەکەم کە گەورەترین سورەتە لە قورئاندا.**

**دەستی منی گرت، کاتێک ویستمان بچینە دەرەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ! فەرمووت پێم کە گەورەترین سورەتت فێردەکەم لەقورئاندا، کامەیە؟**

**فەرمووی: ئەو سورەتەیە(الحمدلله رب العالمين)(سورەتی الفاتحة)، وە قورئانی مەزن کە خودای گەورە بە خەڵات پێی بەخشیوم.**

---

[1] اخرجه البخاري(٤٤٧٤).

## خوێندنی سورەتی (البقرة)

**٤٣- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {لا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقابِرَ، إنَّ الشَّيْطانَ يَنْفِرُ مِنَ البَيْتِ الذي تُقْرَأُ فيه سُورَةُ البَقَرَةِ}[1].

**واتە: ماڵەكانتان مەكەن بە گۆڕستان، شەیتان ڕادەكات لەو ماڵەی كە سورەتی (البقرة)ی تێدا دەخوێندرێت.**

**٤٤- لەفەرموودەیەكی تردا دەفەرمویت:** {اقْرَؤُوا سُورَةَ البَقَرَةِ، فإنَّ أخْذَها بَرَكَةٌ، وتَرْكَها حَسْرَةٌ، ولا تَسْتَطِيعُها البَطَلَةُ}[2].

**واتە: سوڕەتی (البَقَرَة) بخوێنن، چونكە بەڕاستی دەست پێوەگرتنی بەرەكەتە(بۆ تەواوی ژیان)، وە وازلێهێنانی و نەخوێندنەوەی، پەشیمانیە، هەروەها شەیتانەكانیش توانایی ئەم سورەتەیان نیە(یاخود ساحیرەكانیش ناتوانن زیان بەو كەسە بگەیەنن كە بەم سوڕەتەوە پەیوەستە).**

---

[1] رواه مسلم (٧٨٠).

[2] رواه مسلم(٨٠٤).

## خوێندنی (آية الكرسي) دوای هەموو نوێژێکی واجب

**٤٥- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَنْ قَرَأَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ لَمْ يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُولِ الْجَنَّةِ إِلَّا أَنْ يَمُوتَ}[1].

**واتە: هەرکەسێک لەدوای هەموو نوێژە واجبەکان (آية الكرسي) بخوێنێت، ئەوە هیچ شتێک ڕێگری لێناکات لەچوونە بەهەشتی تەنها مردن نەبێت(واتە کە مرد دەچێتە بەهەشت).**

## خوێندنی دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی(البقرة)

**٤٦- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَنْ قَرَأَ بِالْآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ البَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ}[2].

**واتە: هەر کەسێک دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی بەقەرە بخوێنێ لە شەودا بەسیەتی.**

---

[1] أخرجه النسائي في (السنن الكبرى) (٩٩٢٨)، والطبراني(٧٥٣٢) واللفظ له، وابن السني في (عمل اليوم والليلة) (١٢٤)، وصححه ابن حبان، وقال ابن حجر في ((نتائج الأفكار)) (٢/٢٩٤): حسنٌ غريب. وصحَّحه بمجموع طرقه الألبانيُّ في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٩٧٢).

[2] رواه البخاري(٥٠٠٨) ومسلم(٨٠٨).

تێبینی: واته: ئەو كەسە پارێزراوە لە شەڕ و خراپە، یاخود جێگای شەونوێژیش دەگرێتەوە، یان جێگای هەموو زیكرەكان دەگرێتەوە، دەكرێت هەموو ئەو واتایانە بگرێتەوە. والله أعلم.

## پاداشتی خوێندنی سورەتی"الكهف" لە هەینیدا

٤٧- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {مَن قَرَأَ سُورةَ الكَهفِ يَومَ الجُمُعةِ أضاءَ له مِنَ النُّورِ ما بَينَ الجُمُعتَيْنِ}[1] .

واتە: هەركەسێک ڕۆژی هەینی سورەتی(الكهف) بخوێنێت، ئەوا ئەوەندە ڕۆشنایی بۆ دائەگیرسێت بەئەندازەی نێوان هەردوو هەینیەكە.

(مەبەست نورێكە بۆ ئەو كەسەی دەخوێنێت).

## خوێندنی سورەتی (المُلْك)

٤٨- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {إِنَّ سُورَةً فِي الْقُرْآنِ ثَلَاثُونَ آيَةً تَسْتَغْفِرُ لِصَاحِبِهَا حَتَّى يُغْفَرَ لَهُ: {تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ}[2].

---

[1] صحيح الترغيب(٧٣٦).

[2] حسن لغيره. أخرجه "ابن حبان"، واللفظ له، صححه "شعيب الأرنؤوط". وأخرجه ابن ماجه (٣٧٨٦)، وأخرجه أبو داود(١٤٠٠) والترمذي(٢٨٩١). والإمام أحمد في مسنده، والحاكم في مستدركه.

واتە: بەڕاستی سورەتێک لە قورئاندا هەیە سی(٣٠) ئایەتە، تکا و داوای لێخۆشبوون دەكات بۆ هاوەڵەکەی(كە بەردەوام دەیخوێنێت) تا خودای گەورە لێی خۆشدەبێت بەهۆیەوە.

## گەورەیی سورەتی "الإخلاص" و "الكافرون"

٤٩- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {مَنْ قرأَ قُلْ يا أَيُّها الْكافِرُونَ عَدَلَتْ لهُ بِرُبْعِ القُرآنِ، ومَنْ قرأَ قُلْ هو اللّهُ أحَدٌ عَدَلَتْ لهُ بِثُلثِ القُرآنِ}[1].

واتە: هەرکەسێک سورەتی( قُلْ يا أيُّها الْكافِرُونَ) بخوێنێت، خێری بەئەندازەی چارەگی قورئانە، وە هەرکەسێک سورەتی(قُلْ هو اللّهُ أحَدٌ) بخوێنێت، خێری بە ئەندازەی سێیەكی قورئانە.

## گەورەیی وتنی ئەم وشانە

٥٠- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي المِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ العَظِيمِ}[2].

[1] حسن، صحيح الجامع(٦٤٦٦).

[2] أخرجه البخاري(٦٦٨٢) ومسلم(٢٦٩٤).

واته: دوو وشه هەن زۆر سووكن لەسەر زمان، گران و قورسن لەتەرازووو (ی كردەوەكان)، خۆشەویستن لەلای ڕەحمان (واته: خوا)، بریتین له: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ)، واته: پاك و بێگەردی و ستایش بۆ خوای مەزن.

## خۆشەویسترین وشه لای خودای گەوره

٥١- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {إِنَّ أَحَبَّ الْكَلَامِ إِلَى اللهِ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ}[1].

واته: بەڕاستی خۆشەویسترین وته لەلای خودای گەوره، بریتیه له وتنی" سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ".

## وتنی ئەم زیكرانه

٥٢- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {مَن قال: رَضيتُ باللَّهِ ربًّا، وبالإسلامِ دينًا، وبِمُحمَّدٍ رسولًا (أو نبيًّا)، وجَبت لَهُ الجنَّةُ}[2].

واته: هەركەسێك وتی ڕازیم بەوەی ( الله ) پەروەردگارم بێت، ئیسلام ئاینم بێت، وموحەمەد پێغەمبەرم بێت؛ ئەوا چوونه بەهەشت بۆ ئەو كەسه واجب دەبێت.

---

[1] اخرجه مسلم(٢٧٣١)

[2] اخرجه ابن حبان(٨٦٣)، وأبو داود(١٥٣١)، وصححه الألباني في صحيح الجامع(٦٤٢٨).

٥٣- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {مَن قال: سبحانَ اللَّهِ العظيمِ وبحمدِهِ غُرِسَتْ لهُ نخلةٌ في الجنَّةِ}[1].

واتە: هەركەسێك بڵێت: "سُبْحانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ" ئەوە دار خورمایەكی لە بەهەشت بۆی دەڕوێت.

## زۆر سوجدە بردن بۆ پەروەردگار

٥٤- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلاَّ كَتَبَ اللّهُ لَهُ بِهَا حَسَنَةً وَحَطَّ بِهَا سَيِّئَةً ، وَرَفَعَ لَهُ بِهَا دَرَجَةً ، فَاسْتَكْثِرُوا مِنَ السُّجُودِ}[2].

واتە: هیچ بەندەیەك نیە سوجدە ببات لەنوێژدا بۆ خوای پەروەردگار ئیلا خودای پەروەردگار خێرێكی بۆ دەنوسێت، وە تاوانێكی بۆ ڕەش دەكاتەوە، وە پلەیەكی بۆ بەرز دەكاتەوە، جا زۆر سوجدە ببەن بۆ خودای پەروەردگار.

## پاداشتی چاندنی دار یان زەڕاعەت

٥٥- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا إِلَّا كَانَ مَا أُكِلَ مِنْهُ لَهُ صَدَقَةً، وَمَا سُرِقَ مِنْهُ لَهُ صَدَقَةٌ، وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ مِنْهُ فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ، وَمَا أَكَلَتِ الطَّيْرُ فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ، وَلَا يَرْزَؤُهُ أَحَدٌ إِلَّا كَانَ لَهُ صَدَقَةٌ}[3].

---

[1] اخرجه الترمذي(٣٦٦٤)، وصححه الألباني في السلسلة(١/٦٤).

[2] صحيح الجامع(٥٧٤٢)، أخرجه ابن ماجه (١٤٢٤)، والبزار (٢٧٠٥) باختلاف يسير، والطبراني في ((المعجم الأوسط)) (٨٦٧) مختصراً باختلاف يسير.

[3] رواه مسلم(١٥٥٢) والبخاري(٢٣٢٠).

واته: هەر مسوڵمانێک دارێک بڕوێنێت یان زەڕاعەتێک بکات، هەرشتێکی لێبخورێت، ئەوا بە چاکە بۆی دەنووسرێت، وە هەرشتێکی لێ بدزرێت، ئەوا بە چاکە بۆی دەنووسرێت، وە ئەوەی ئاژەڵ (گیاندار) یان پەلەوەر و باڵندە لێی دەخۆن بۆی دەبێت بەخێر و چاکە، هەرکەسێکیش لێی ببات هەر بۆی دەبێت بەخێر.

## مۆڵەتدانی کەسی قەرزار

٥٦- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {تَلَقَّتِ المَلائِكَةُ رُوحَ رَجُلٍ مِمَّنْ كانَ قَبْلَكُمْ، فقالوا: أعَمِلْتَ مِنَ الخَيْرِ شيئًا؟ قالَ: لا، قالوا: تَذَكَّرْ، قالَ: كُنْتُ أُدايِنُ النَّاسَ فَآمُرُ فِتْيانِي أنْ يُنْظِرُوا المُعْسِرَ، ويَتَجَوَّزُوا عَنِ المُوسِرِ، قالَ: قالَ اللهُ عزَّ وجلَّ: تَجَوَّزُوا عنْه}[1].

واته: فریشتە گەیشتن بە ڕۆحی پیاوێکی پێش ئێوە، پێیان وت: ئایا هیچ خێر و چاکەیەکت کردووە؟ وتی: نەخێر. وتیان: بیر بکەوە، وتی:(بیرم کەوتەوە) من قەرزم دەدا بەخەڵک و فەرمانم دەکرد بە خزمەتکار و شاگردەکانم کە مۆڵەتی زیاتر بدەن بە کەسی نەدار و سەبری زیاتری لەسەر بگرن بۆ دانەوەی قەرزەکەی، لە هەندێک قەرزی کەسی هەبوویش خۆش بن، چاوپۆشی لەبەشێکی بکەن.

جا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو: چاوپۆشی لێبکەن (لە گوناهەکانی خۆشبووم).

[1] رواه البخاري(٢٠٧٧) ومسلم(١٥٦٠).

٥٧- پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رموێت: {مَنْ أنظرَ مُعْسِرًا، فلَهُ بكُلِّ يومٍ مثلُهُ صدَقةٌ، قبلَ أنْ يحِلَّ الدينُ، فإذا حلَّ الدينُ فأنظَرَهُ فلَهُ بِكُلِّ يومٍ مثلاهُ صدَقَةٌ}[1].

واته: هه‌رکه‌سێک ماوه بدات به ده‌ست کورتێک به‌ر له‌وه‌ی ماوه‌ی دانه‌وه‌ی بێته‌وه، بۆ هه‌ر ڕۆژێک چاکه‌یه‌کی بۆ ده‌نوسرێت، وه ئه‌گه‌ر کاتی دانه‌وه‌ی قه‌رزه‌که هات و خاوه‌ن قه‌رزه‌که ماوه‌ی قه‌رزار بدات و له‌سه‌ری بوه‌ستێت، بۆ هه‌ر ڕۆژێک که مۆڵه‌تی ده‌دات به ئه‌ندازه‌ی بڕی قه‌رزه‌که خێر و چاکه‌ی بۆ ده‌نوسرێت.

## ئـــــــــاودان

٥٨- پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رموێت: {بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْرًا، فَنَزَلَ فِيهَا، فَشَرِبَ، ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ، يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ : لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَ مِنِّي. فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلَأَ خُفَّهُ مَاءً، ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ حَتَّى رَقِيَ، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ". قَالُوا : يَا رَسُولَ اللهِ، وَإِنَّ لَنَا فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ لَأَجْرًا ؟ فَقَالَ : " فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ}[2].

واته: جارێکیان پیاوێک به ڕێگایه‌کدا ده‌ڕۆیشت، تێنوێتی زۆری بۆ هێنا و زۆر تێنوو بوو، بیرێکی دۆزیه‌وه، دابه‌زیه ناوی تا تێر ئاوی خوارده‌وه، پاشان هاته ده‌ره‌وه، بینی سه‌گێک زمانی ده‌رهێناوه له زۆری تێنوێتیدا و خۆڵی شێدار

---

[1] صحيح الجامع(٦١٠٨).

[2] متفق عليه، رواه البخاري(٢٤٦٦) ومسلم(٢٢٤٤).

دەخوات، پیاوەکە وتی: بەڕاستی ئەو سەگە لە تێنواندا وەکو منی لێهاتووە، ئیتر دابەزیە ناو بیرەکە و خوفەکانی پڕکرد لە ئاو و بەدەم گرتنی تا هاتەوە سەرەوە، جا سەگەکە ئاوەکەی خواردەوە، ئیتر خودای گەورە لەسەر ئەو کارەی پیاوەکە سوپاسی کرد و لێیشی خۆشبوو.

هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ! ئایا لەسەر ئاژەڵان پاداشتمان بۆ هەیە ئەگەر خزمەتیان بکەین؟

فەرمووی: هەموو خاوەن ڕۆحێک کە تەڕایی ژیانی تێدایە پاداشتی لەسەرە ئەگەر خزمەتیان بکەن.

## خۆشویستن لە پێناو خودای گەورە جَلَّ جَلَالُه

٥٩- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ : أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلَالِي، الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي، يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلِّي}[1].

واتە: بەڕاستی خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێت: کوان ئەوانەی لەبەر خاتری من یەکتریان خۆشدەویست؟ ئەمڕۆ من ئەیانخەمە ژێر سێبەری خۆمەوە، ڕۆژێک کە جگە لە سێبەری من هیچ سێبەرێکی تر نیە.

تێبینی: مەبەست لەوەی کە خودای گەورە دەفەرموێت: (سێبەری من)، واتە سێبەری عەرشی خودای گەورە، چونکە فەرموودەی ترمان هەیە سێبەرەکەی پەیوەست کردووە بە عەرشەوە، واتە خودای گەورە دەی خاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە، وەک پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا، أَوْ وَضَعَ

[1] رواه مسلم(٢٥٦٦).

لَهُ أَظَلَّهُ اللَّهُ فِي ظِلِّ عَرْشِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). رواه احمد(٨٧١١)، وقال شعيب الأرنؤوط: صحيح على شرط مسلم.

وە کاتێک خودای گەورە سێبەرەکە بۆخۆی دەگێڕێتەوە، مەبەست لە تەشریف و ڕێز و گەورەییە، واتە هەرچی شتە کە هەیە بە سێبەری عەرشەکەشەوە هەر خودا خاوەنیەتی، هەروەک دەڵێین: " بيت الله" یان "ناقة الله" :ماڵی خودا، یان وشتری خودا، واتە هەرخودا خاوەنی کەعبەیە، حاوەنی وشترەکەیە و تایبەتە بەو، بۆ سێبەرەکەش هەر ئەو تواناى بەدیهێنانی هەیە و تەنها سێبەری عەرشەکەی بوونی هەیە، نەک وا گومان بکرێت کە خودا سێبەری هەبێت! حاشا، پاکی و بێگەردی بۆ خودای گەورە، چونکە خودای گەورە تەنێک نیە سێبەر بکات، وە بەهیچ شتێک ناچێت، دوورە لە هەرچی کەم و کوڕیە. سبحانه وتعالى.

## داپۆشینی عەیب و عاری خەڵکی

**٦٠- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {لا يَسْتُرُ عَبْدٌ عَبْدًا في الدُّنْيا، إلَّا سَتَرَهُ اللَّهُ يَومَ القِيامَةِ}[1].

**واتە: هەر بەندەیەک بەندەیەکی تر سیتر بکات و هەڵەکانی بپۆشێت، ئەوا خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا هەڵەکانی ئەو بەندەیە دەپۆشێت وسیتریان دەکات.**

## خێرکردن بە خزم و نزیکەکان

**٦١- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {الصَّدقةُ على المسْكينِ صدقةٌ، وعلى ذي القرابةِ اثنتان: صدقةٌ وَصِلةٌ}[2].

---

[1] رواه مسلم(٢٥٩٠).

[2] صحيح لغيره. أخرجه الترمذي (٦٥٨)، والنسائي (٢٥٨٢)، وابن ماجه (١٨٤٤) واللفظ له، وأحمد (١٦٢٧٩). و صححه الألباني في صحيح ابن ماجة(١٥٠٦) وايضا في صحيح الجامع(٣٨٥٨).

واته: خێرکردن به کەسی هەژار چاکەیەکە، وه خێرکردن به کەسی نزیک(خزم) دوو شته (دوو پاداشته): هەم خێرکردنه، هەمیش بەجێگەیاندنی پەیوەندی خزمایەتیە.

## ڕوو خۆشی

٦٢- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {كُلُّ معروفٍ صدقةٌ وإنَّ منَ المعروفِ أن تلقَى أخاكَ بوجْهٍ طَلقٍ وأن تُفرِغَ مِن دلْوِكَ في إناءِ أخيكَ}[1].

واته: هەموو چاکەکردنێک خێر و سەدەقەیە، وه بێگومان ئەوەش خێر و چاکەیە کە بە ڕوویەکی خۆش بەپیر برا موسڵمانەکەتەوە بچیت، و له دۆڵچە و دەفری خۆتەوە ئاو یان خواردنێک بخەیتە دەفری براکەتەوە(ئەمەشیان خێر و سەدەقەیە).

## خواردنەوەی توڕەیی

٦٣- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {مَن كَظَمَ غيظًا وهو قادرٌ على أن يَنْفِذَه، دعاه اللهُ عزَّ وجلَّ على رؤوسِ الخلائقِ يومَ القيامةِ، حتى يُخَيِّرَه اللهُ مِن الحُورِ ما شاءَ}[2].

واته: ئەو کەسەی بتوانێ ڕقی خۆی به یەکێک بڕێژێت، بەڵام لەبەر ڕەزامەندی خودای گەورە توڕەیی خۆی بخواتەوە، ئەوە له ڕۆژی قیامەتدا خودای گەورە

[1] اخرجه الترمذي (١٩٧٠)، وأحمد (١٤٨٧٧) واللفظ لهما. وقال الترمذي: هذا حديث حسن. وأخرجه البخاري (٦٠٢١) مختصراً. وصححه الألباني في صحيح الترمذي(١٩٧٠).

[2] أخرجه أبو داود (٤٧٧٧)، والترمذي (٢٤٩٣)، وابن ماجه (٤١٨٦)، وأحمد (١٥٦٣٧) باختلاف يسير، وصححه الألباني في صحيح أبي داود(٤٧٧٧).

لەپێش چاوی هەموو خەڵکیەوە بانگی دەکات تا سەرپشکی بکات بە ئارەزووی خۆی لە حۆریەکانی بەهەشت هەڵبژێرێت.

## ڕاستگۆیی لە داواکردنی شەهیدی لەپێناو خودا

**٦٤- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن سَأَلَ اللّٰهَ الشَّهادةَ بِصِدقٍ، بلَّغَهُ اللّٰهُ مَنازِلَ الشُّهداءِ، وَ إِن مَّاتَ على فِراشِه}[1].

واتە: هەرکەسێک بەڕاستی و لەدڵەوە داوای شەهیدی بکات لەپێناو خودای گەورە، ئەوە خودای گەورە دەیگەیەنێتە پلەی شەهیدەکان، ئەگەرچی لەسەر جێگای خۆیشی بمرێت.

## ڕەوشت جوانی

**٦٥- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ}[2].

واتە: هیچ شتێك گرانتر نییە لە ڕەوشت جوانی لەسەر تەرازوو(لەڕۆژی قیامەتدا).

---

[1] رواه مسلم(١٩٠٩).

[2] رواه أبو داود (٤٧٩٩)، واحمد(٢٧٥١٧)، ورواه الترمذي (٢٠٠٢)، وقال: "وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ"، وصححه الألباني في "السلسلة الصحيحة" (٢ / ٥٣٥).

تێبینی: بۆیە ڕەوشت جوانی ئەوەندە گرانە، چونکە تەواوی دین بریتیە لە فێرە ڕەوشت کردنی مرۆڤ. ڕەوشت و ئەدەبی جوان بەرامبەر خودای گەورە، بەرامبەر پێغەمبەرﷺ بەرامبەر باوەڕداران، ڕاستگۆبوون لەگەڵیان، فێڵنەکردن لێیان، خیانەت نەکردن لێیان، ڕوخۆشبوون، یارمەتی دانیان......هەموو ئەوانە خورەوشتن، بۆیە گرانترینە، چونکە دینی تێدا کۆبووەتەوە.

## پۆشینی جل و بەرگ

٦٦- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {مَنْ لَبِسَ ثَوْبًا فَقَالَ : الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ. غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ}[1].

واتە: هەرکەسێک پۆشاکێک بپۆشێت و بڵێت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ)، ئەوە لەهەموو گوناهەکانی پێشووی دەبوردرێت.

تێبینی: بۆیە ئەو پاداشتەی بۆ هەیە، چونکە ئەو کەسە هەست دەکات کە هەر خودایە ئەو کەسەی پۆشتە کردووە جل و بەرگی پێداوە، خۆ چەندین کەسیتر هەن جلی نیە بیپۆشێت، شەرم بەخۆی دەکاتەوە بچێتە دەر لەبەر بێ جلی،... کەچی ئەو بە کەشخەییەوە دەچێتە ناو خەڵکەوە، جلەکانی ئوتوکراون، خاوێن و باوێن، بەڵێ هەمیشە حەقە شوکرانەی خودای لەسەر بکرێت، چونکە جل دیارترین نیعمەتی خودای گەورەیە بەسەر جەستەی مرۆڤەوە.

[1] اخرج الدارمي(٢٧٣٢)، و ابو يعلى في مسنده(١٤٢٨)، وحسَّنه الألباني لغيره في صحيح الترغيب والترهيب.

## تەوقەكردن

**٦٧- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا لَقِيَ الْمُؤْمِنَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ ، وَأَخَذَ بِيَدِهِ ، فَصَافَحَهُ ، تَنَاثَرَتْ خَطَايَاهُمَا ، كَمَا يَتَنَاثَرُ وَرَقُ الشَّجَرِ}[1].

**واتە: بەڕاستی کاتێک باوەڕدارێک دەگات بە باوەڕدارێک و سەلامی لێدەکات و دەستی دەگرێت و تەوقەی لەگەڵ دەکات، ئەوە ئەم دوو باوەڕدارە گوناهەکانیان دەوەرێن وەک چۆن گەڵای دار دەوەرێت.**

## سێ شت پاداشتیان نابڕێتەوە دوای مردنیش

**٦٨- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {إِذَا مَاتَ الْإِنسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُه إِلَّا مِن ثَلاثٍ؛ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ ، أَوْ عِلْمٍ يُنتَفَعُ بِه، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَه}[2].

**واتە: کاتێ مرۆڤێک دەمرێت هەموو کردەوەیەکی لەدوای خۆی دەپچڕێت، تەنها لە سێ شت نەبێت: کارێکی خێری کردبێت، خێرێکی بەردەوام، یان زانستێک سوودی لێببینرێت لەدوای خۆی، یان منداڵێکی ساڵحی هەبێت و دوعای خێری بۆبکات.**

---

[1] اخرجه الطبراني في الأوسط (٢٤٥)، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة(١٦).
[2] رواه مسلم(١٦٣١).

## حەوت كەس لەژێر سێبەری عەرشی خودای گەورەدان

**٦٩-** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ، يَومَ لا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ: الإِمَامُ العَادِلُ، وشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ رَبِّهِ، ورَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي المَسَاجِدِ، ورَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمعا عليه وتَفَرَّقَا عليه، ورَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وجَمَالٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ، ورَجُلٌ تَصَدَّقَ، أَخْفَى حتَّى لا تَعْلَمَ شِمَالُهُ ما تُنْفِقُ يَمِينُهُ، ورَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ}[1].

واتە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: حەوت جۆر كەس هەن كە خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، لەو ڕۆژەدا كەهیچ سایەو سێبەرێك نییە جگە لەسایەو سێبەری ئەو زاتە:

١- پێشەوایەكی دادپەروەر.

٢- لاوێک كەلەسەر خواپەرستی گەورە بووبێت.

٣- كەسێک دڵی پـــەیوەست بێت بەمزگەوت.

٤- دوو كەس لەبەر خوای گەورە یەكتریان خۆشبووێت و لەبەر خۆشەویستی خودا كۆ دەبنەوە و هەر لەسەر ئەم خۆشەویستیەش یەكتر بەجێدێڵن.

٥- كەسێكیش ئافرەتێكی جوان و ناودار بانگی بكات(بۆ كاری خراپە) ئەویش بڵێت من لەخوا دەترسم.

٦- كەسێک خێردەكات و دەیشارێتەوە هەتا دەستی چەپی نازانێت دەستی ڕاستی چی بەخشیوە.

٧- كەسێک بەتەنها یادی خوا بكات و چاوەكانی ئەسرینیان لێ ببارێت.

---

[1] رواه البخاري(٦٦٠) ومسلم(١٠٣١).

## بیر هەڵکەندن

**٧٠- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن حَفَرَ ماءً لَمْ تَشْرَبْ مِنْه كبِدٌ حرَّى مِن جنٍّ ولا إنسٍ ولا طائرٍ إلَّا آجَره اللهُ يومَ القيامةِ}[1].

**واتە: هەرکەسێک بیرێک هەڵکەنێت بە نیازی ئەوەی تینوویەک ئاوی لێ بخواتەوە لە جنۆکە و مرۆڤ و باڵندەکان، ئیللا خودای گەورە لەڕۆژی دواییدا پاداشتی دەداتەوە.**

## زیکری دوای نوێژی مەغریب و بەیانی

**٧١- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {من قال قبلَ أن ينصرفَ ويَثني رجلَيه من صلاةِ المغربِ والصبحِ: لا إِلَهَ إِلَّا اللهُ ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، عشرَ مراتٍ، كتب اللهُ له بكل واحدةٍ عشرَ حسناتٍ، ومحا عنه عشرَ سيئاتٍ، ورفع له عشرَ درجاتٍ، وكانت حِرزًا من كلِّ مكروهٍ، وحِرزًا من الشيطانِ الرجيمِ، ولم يحلَّ لذنبٍ أن يُدركَه إلا الشركُ، وكان من أَفضلِ الناسِ عملًا، إلا رجلًا يفضُلُه، يقول أفضلَ مما قال}[2].

**واتە: هەرکەسێک بەرلەوەی لەشوێنی خۆی بجوڵێت و پێکانی بجوڵێنێت لەدوای سەلامدانەوەی نوێژی مەغریب و بەیانی دە جار بڵێت:( لا إِلَهَ إِلَّا اللهُ ، وَحْدَهُ لَا**

---

[1] أخرجه مطولاً البخاري في ((التاريخ الكبير)) (٣٣٢/١)، وابن خزيمة (١٢٩٢) واللفظ له، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب(٢٧١).

[2] حسن لغيره، صحيح الرغيب(٤٧٧).

شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ئەوە خودای گەورە بەهەرجارێک کە ئەمەی وتووە دە چاکەی بۆ دەنوسێت، وە دە خراپەی لەسەر لادەبات، وە دە پلەش بەرزی دەکاتەوە، دەبێتە هۆی پاراستنی لەهەموو شتێکی خراپ، وە پاراستنی لە شەیتانی ڕەجم کراو، وە هیچ گوناهێک زەرەری پێناگەیەنێت و کردەوەکانی بەتاڵ ناکاتەوە تەنها هاوبەش پەیدا کردن نەبێت بۆ خودای گەورە، کە ئەمە هەموو کردەوەکان بەتاڵ دەکاتەوە، وە لەچاکترینی خەڵکیە لەکردەوەی چاکەدا، مەگەر کەسێک لەپێشتربێت لەو و زیاتر لە ئەو زیکرەکە بڵێت.

## دوعای چونە بازاڕ

**٧٢- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن دخل السُّوقَ فقال: لا إلٰه إلا اللّٰهُ وحدَه لا شريكَ له، له الملكُ، وله الحمدُ، يُحْيِي ويُمِيتُ، وهو حيٌّ لا يموتُ بيدِه الخيرُ، وهو على كلِّ شيءٍ قديرٌ، كتب اللّٰهُ له ألفَ ألفِ حسنةٍ، ومحا عنه ألفَ ألفِ سيئةٍ، ورَفَعَ له ألفَ ألفِ درجةٍ، وبَنَى له بيتًا في الجنةِ}[1].

واتە: هەرکەسێك چووە بازاڕ و ئینجا وتی(لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ ، يُحْيِي وَيُمِيتُ ، وَهُوَ حَيٌّ لاَ يمُوتُ ، بِيَدِهِ الخَيرُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ئەوە هەزار هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێت، وە هەزار هەزار گوناهی لەسەر لادەبردرێت، وە هەزار هەزار پلە بەرزدەکرێتەوە،ماڵێکیشی لە بەهەشت بۆ دروست دەکرێت.

---

[1] حسن، صحيح الجامع(٦٢٣١).

## داوای لێخۆشبوونکردن بۆ باوەڕداران

**٧٣-** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {مَنِ اسْتَغْفَرَ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلِلْمُؤْمِناتِ، كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ حَسَنَةً}[1].

هەرکەسێک داوای لێخوشبوون بکات لەخودای گەورە بۆ پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار، ئەوە خودای گەورە لە بەرامبەر هەر بڕوادارێکی پیاو یان ئافرەت چاکەیەکی بۆ دەنوسێت.

## یارمەتی دانی بێوەژن

**٧٤-** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالمِسْكِينِ، كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوِ القَائِمِ اللَّيْلَ الصَّائِمِ النَّهَارَ}[2].

واتە: ئەو کەسەی پێداویستیەکانی بێوەژن و هەژار جێبەجێدەکات وەکو کەسی موجاهید و تێکۆشەر وایە لە پێناو خوای گەورە، وەکو ئەو کەسەش وایە شەو نوێژ دەکات و هەر بە پێوەیە (بێزار نابێت)، و وەکو ئەو کەسەش وایە کە بەردەوام بەڕۆژوو دەبێت.

---

[1] حسن، صحيح الجامع(٦٠٢٦).

[2] رواه البخاري(٥٣٥٣).

## پاداشتی گێڕانەوەی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ

**٧٥- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {نضَّرَ اللَّهُ امرأً سَمعَ منَّا حَديثًا فبلَّغَهُ، فرُبَّ مُبلَّغٍ أَحفَظُ مِن سامِعٍ}[1].

**واتە: خودا ڕووی ئەو کەسە ڕۆشن و جوان بکات کە فەرموودەیەکی من دەبیستێت و پاشان دەیگەیەنێت بە خەڵکی تر، چونکە هەندێک کەس هەیە کە فەرموودەکەی پێدەگات شارەزاتر و پارێزگارترە لەو کەسەی کە لە منەوە بیستوویەتی.**

## ئامادەبوون بۆ جەنازە

**٧٦- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن شَهِدَ الجَنازَةَ حتَّى يُصَلَّى عليها فَلَهُ قِيراطٌ، ومَن شَهِدَها حتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيراطانِ، قيلَ: وما القِيراطانِ؟ قالَ: مِثْلُ الجَبَلَيْنِ العَظِيمَيْنِ}[2].

**واتە: هەرکەسێک ئامادەی جەنازەیەک بێت تا نوێژی لەسەر دەکرێت، ئەوە قیراتێکی بۆ هەیە، وە هەرکەسێکیش ئامادەبێت تا دەشینێژن ئەوە لە پاداشتیدا دوو قیراتی بۆ هەیە، وترا: دوو قیراتەکە چییە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟ فەرمووی: وەکو دوو چیای زۆر گەورەن.**

---

[1] صحيح ابن ماجه(١٩٠)، أخرجه الترمذي (٢٦٥٧)، وابن ماجه (٢٣٢) واللفظ له، وأحمد (٤١٥٧).

[2] صحيح مسلم(٩٤٥).

## گەورەیی ئەم زیکرانە

**٧٧- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن قالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، مِائَةَ مَرَّةٍ، لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يومَ القِيَامَةِ بأَفْضَلَ ممَّا جَاءَ به، إلَّا أَحَدٌ قالَ مِثْلَ ما قالَ، أَوْ زَادَ عليه}[1].

**واتە:** هەرکەسێک کە بەیانی کردەوە و ئێوارەی کردەوە و سەد جار وتی: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ) ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ کەسێک ناتوانێت وەک ئەو بێنێت لەوەی کە ئەو هێناویەتی، مەگەر کەسێک وەک ئەوی وتبێت یان زیاتر.

**٧٨- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَنْ قَالَ إِذَا أَصْبَحَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ؛ كَانَ لَهُ عِدْلُ رَقَبَةٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَكُتِبَ لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ، وَحُطَّ عَنْهُ عَشْرُ سَيِّئَاتٍ، وَرُفِعَ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ، وَكَانَ فِي حِرْزٍ مِنَ الشَّيْطَانِ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ قَالَهَا إِذَا أَمْسَى كَانَ لَهُ مِثْلُ ذَلِكَ حَتَّى يُصْبِحَ}[2].

**واتە:** هەرکەسێک کە بەیانی کردەوە و (یەکجار)بڵێت: ( لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) خودای گەورە بە ئەندازەی ئەو کەسە خێری بۆ دەنوسێت کە بەندەیەکی ڕزگار کردبێ لە نەوەکانی پێغەمبەر ئیسماعیل (عليه الصلاة والسلام)، دە چاکەشی بۆ دەنوسرێت، دە خراپەشی لەسەر ڕەشدەکرێتەوە، دە پلەش بەرزدەکرێتەوە، وە پارێزراویش دەبێت لەشەیتان تا ئێوارە دادێت، وە ئەگەر ئێوارە بخوێنێت تا بەیانی دادێت هەمان شتی بۆ هەیە.

---

[1] صحيح مسلم(٢٦٩٢).

[2] صحيح أبي داود(٥٠٧٧).

**٧٩- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** {من قال حين يُصبحُ: "لَا إِلَهَ إِلّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ" عشرَ مراتٍ، كتب اللهُ له بكل واحدةٍ قالها عشرَ حسناتٍ، وحطَّ عنه عشرَ سيئاتٍ، ورفعه اللهُ بها عشرَ درجاتٍ، وكُنَّ له كعشرِ رقابٍ، وكُنَّ له مَسلحةً من أولِ النهارِ إلى آخرِه، ولم يعملْ يومئذٍ عملًا يقهرهُنَّ، فإن قال حين يُمسي فمثلُ ذلك}[1].

**واتە: هەر كەسێک بەیانی بەسەرداهات و دە جار وتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ئەوە خودای گەورە بۆ هەر جارێک کە وتوویەتی دە چاکەی بۆ دەنوسێت، وە دە خراپەشی لەسەر ڕەشدەکاتەوە، وە بەهۆیەوە دە پلە بەرزی دەکاتەوە، وە بەئەندازەی ڕزگارکردنی دە کۆیلە پاداشتی بۆ دەنوسێت، وە دەبێتە هۆی پاراستنی لەسەرەتای ڕۆژەوە تا کۆتاییەکەی، وە هیچ شتێک و گوناهێکیش کە توشیدەبێت نابێتە هۆی بەتاڵبوونەوەی کردەوە چاکەکانی و پارێزراوە، وە ئەگەر ئێوارە بوویەوە و ئەمەی وت، هەر بەم جۆرەی بۆ هەیە.**

**٨٠- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** {من قال في يومٍ مائتَيْ مرَّةٍ [مائةً إذا أصبح، ومائةً إذا أمسى]: " لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ "، لم يسبِقْه أحدٌ كان قبله، ولا يُدرِكُه أحدٌ بعده، إلّا من عمِل أفضلَ من عملِه}[2].

**واتە: هەرکەسێک لە ڕۆژێکدا دووسەد جار "سەد جار لە بەیانیان و سەدجاریش لە ئێواران"دا بڵێت: ( لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ،**

---

[1] السلسلة الصحيحة(١١٤).

[2] إسناده حسن، السلسلة الصحيحة(٢٧٦٢).

وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ئەوە هیچ کەسێک پێشی ناکەوێت کە لە پێشیەوە بووبێت، وە هیچ کەسیش کە لەدوای ئەمەوەن پێی ناگەنەوە، مەگەر کەسێک کردەوەیەکی لەم باشتری ئەنجامدابێت.

٨١- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {من قال: (سبحان اللهِ) مئةَ مرةٍ قبل طلوعِ الشمسِ وقبل غروبِها؛ كان أفضلَ من مئةِ بدنةٍ، ومن قال: (الحمدُ لله) مئةَ مرةٍ قبلَ طلوعِ الشمسِ وقبلَ غروبِها؛ كان أفضلَ من مئةِ فرسٍ يُحمَلُ عليها في سبيلِ اللهِ، ومن قال: (اللهُ أكبرُ) مئةَ مرةٍ، قبلَ طلوعِ الشمسِ وقبلَ غروبِها، كان أفضلَ من عتقِ مئةِ رقبةٍ، ومن قال: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) مئةَ مرةٍ قبلَ طلوعِ الشمسِ وقبلَ غروبِها، لم يَجِيءْ يومَ القيامةِ أَحَدٌ بعملٍ أفضلَ من عملِه، إلا من قال مثلَ قوْلِه، أو زاد عليه}[1].

واتە: هەرکەسێک سەد جار بڵێت:(سبحان الله) پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆر ئاوابوون ئەوە باشترە بۆی لە سەد وشتر، وە هەرکەسێک سەد جار بڵێت:(الحمدلله) پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆر ئاوابوون ئەوە باشترە بۆی لە سەد ئەسپ کە هەڵیگرن و لەپێناو خودای گەورە پێیان بجەنگێت، وە هەرکەسێک سەد جار بڵێت: (الله أكبر)پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆر ئاوابوون ئەوە باشترە بۆی لە ئازادکردنی سەد کۆیلە.
وەهەرکەسێک سەد جار بڵێت:(لاَ إِلَهَ إِلَّا الله، وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆر ئاوابوون، ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا هیچ کەسێک وەک ئەو کەسە کردەوەی چاکەی پێ نییە، مەگەر کەسێک وەک ئەو وتبێتی یان زیاتری وتبێت.

[1] حسن، صحيح الترغيب(٦٥٨).

**٨٢- جوەیریەی کچی حارس(خێزانی پێغەمبەرﷺ) دەڵێت:** {أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ مِن عِندِها بُكْرَةً حِينَ صَلَّى الصُّبْحَ وَهي في مَسْجِدِها، ثُمَّ رَجَعَ بَعْدَ أَنْ أَضْحى وَهي جالِسَةٌ، فَقالَ: ما زِلْتِ على الحالِ الَّتي فارَقْتُكِ عَلَيْها؟ قالَتْ: نَعَمْ، قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لقَدْ قُلتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِماتٍ ثَلاثَ مَرّاتٍ، لو وُزِنَتْ بما قُلْتِ مُنْذُ اليَومِ لَوَزَنَتْهُنَّ: سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدادَ كَلِماتِهِ}[1].

**واتە: پێغەمبەرﷺ بەیانی زوو دوای ئەوەی نوێژی کرد، لەلای جوەیریە چووە دەر کە ئەوکات جوەیریە لەسەر جێ نوێژەکەی بوو و زیکری دەکرد، پێغەمبەرﷺ لەکاتی چێشتەنگاودا گەڕایەوە پێی فەرموو: ئەوە هێشتان لەسەر ئەو حاڵە ماوی کە من بەجێم هێشتی؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دوای ئەوەی تۆم بەجێهێشت چوار وشەم "سێجار" دووبارە کردنەوە، ئەگەر بکێشرێت لەگەڵ هەموو ئەوانەی ئەمڕۆ لەبەیانیەوە تۆ وتووتە، ئەوا بەقەدەر هەموو زیکرەکەی تۆ دەبێت لەپاداشتدا، ئەوانیش:( سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدادَ كَلِماتِهِ.).**

**٨٣- پێغەمبەرﷺ بە "ابو أمامة الباهلي" ی فەرموو:** {ألا أُخبرُك بأفضلَ أو أكثرَ من ذكرِك الليلَ مع النهارِ والنهارَ مع الليل؟ أن تقول: سبحان اللهِ عدَدَ ما خلق، سبحان اللهِ مِلْءَ ما خلق، سبحان اللهِ عددَ ما في الأرض والسماءِ، سبحان اللهِ مِلْءَ ما في السماء والأرضِ، سبحان اللهِ مِلْءَ ما خلق، سبحان اللهِ عددَ ما أحصى كتابُه، وسبحان اللهِ مِلْءَ كلِّ شيءٍ، وتقول: الحمدُ للهِ، مثلَ ذلك}[2].

---

[1] رواه مسلم(٢٧٢٦).

[2] السلسلة الصحيحة(٢٥٧٨).

واته: ئایا هەواڵت پێنەدەم بە چاكتر  یان زۆرتر لەو زكرەی كە تۆ دەیكەی بە شەو و بە ڕۆژ؟

بڵێ(سُبْحَانَ الله عَدَدَ مَا خَلَقَ، سُبْحَانَ الله مِلْءَ مَا خَلَقَ، سُبْحَانَ الله عَدَدَ مَا في الْأَرْضِ وَالسَّمَاءِ، سُبْحَانَ الله مِلْءَ مَا في الْأَرْضِ وَالسَّمَاءِ، سُبْحَانَ الله مِلْءَ مَا خَلَقَ،  سُبْحَانَ اللّٰهِ عَدَدَ مَا أَحْصَىٰ كِتَابُهُ، سُبْحَانَ الله مِلْءَ كُلِّ شَيْءٍ)، وە بۆ (الحمدلله) هەمان شت دەڵێیتەوە.

**٨٤- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {إنَّ سُبْحانَ اللَّهِ، والْحَمْدُ لِلهِ، ولا إلَهَ إلّا اللّٰهُ، واللّٰهُ أكبرُ تَنفُضُ الْخَطايا، كَما تَنفُضُ الشَّجَرةُ ورَقَها}[1].

واته: بەڕاستی وتنی(سُبْحانَ اللَّهِ، والْحَمْدُ لِلهِ، ولا إلَهَ إلّا اللّٰهُ، واللّٰهُ أكبرُ) گوناهـ و تاوان هەڵدەوەرێنن وەک چۆن دار گەڵاكانی هەڵدەوەرێنێت.

**٨٥- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {طوبى لِمَنْ وجدَ في صَحيفَتِه اسْتِغْفارًا كَثيرًا}[2].

واته: خۆش بە حاڵی ئەو كەسەی كە پەڕاوی كردەوەكانی، داوای لێخۆشبوونی زۆری تێدایە.(واته زۆر " أستغفرالله " ی كردووە).

---

[1] صحيح الجامع(٢٠٨٩).

[2] صحيح الجامع(٣٩٣٠).

## پێدانی خۆراک بە ڕۆژووەوان

**٨٦- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجرِهِ، غَيرَ أَنَّهُ لَا ينقصَ مِنْ أجْرِ الصَّائِمِ شَيْئًا}[1].

**واتە: هەرکەسێک خواردنی ڕۆژووشکاندن ببەخشێت بە ڕۆژووگرێک؛ ئەوا هەمان پاداشتی ڕۆژووگرەکەی بۆ هەیە بە بێ ئەوەی هیچ شتێک لە پاداشتی ڕۆژووگرەکە کەم بکات.**

## داواکردنی بەهەشت سێجار
## پەنا گرتن لە ئاگر سێجار

**٨٧- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {من سأل اللّهَ الجنَّةَ ثلاثَ مرّاتٍ قالتِ الجنَّةُ: اللَّهمَّ أَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، ومن اسْتَجَار مِنَ النّارِ ثَلاثَ مرّاتٍ قالتِ النّارُ: اللَّهُمَّ أجِرْهُ مِنَ النّارِ}[2].

**واتە: هەرکەسێک سێجار داوای بەهەشت لەخودای گەورە بکات، بەهەشت دەڵێت: خودایە بیخەیتە بەهەشتەوە، وە هەرکەسێکیش پەنابگرێت بەخودای گەورە لە ئاگری دۆزەخ، ئینجا دۆزەخ دەڵێت: خودایە ڕزگاری بکەی لە ئاگر و پەنای بدە.**

---

[1] صحيح الترغيب(٦٤١٥).

[2] صحيح الترمذي(٢٥٧٢).

## چوونە بەهەشت بەبێ لێپێچینەوە

**٨٨- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {يَدْخُلُ الجَنَّةَ مِن أُمَّتي سَبْعُونَ أَلْفًا بغيرِ حِسابٍ، هُمُ الَّذِينَ لا يَسْتَرْقُونَ، ولا يَتَطَيَّرُونَ، وعلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ}[1].

**واتە: لە ئوممەتی من حەفتا هەزار کەس بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت، ئەو کەسانەن کە: داوای ڕوقیە لەکەس ناکەن تا بەسەریاندا بخوێنن کاتێک نەخۆش دەکەون، وە ڕەشبینی و گەشبینی ناکەن (بە هۆی هەڵفڕاندنی باڵندەوە، سیفەتێکی جاهیلی بوو باڵندەیەکیان هەڵدەفڕاند ئەگەر بەلای ڕاستدا ڕۆیشتبوا ئەوا پێیان وابوو سەفەرەکەیان خێری پێوەیە، وە ئەگەر بەلای چەپدا ڕۆیشتبوا، پێیان وابوو شەڕی تێدایە سەفەرەکەیان)، وە خۆیان داغ ناکەن (وەک چارەسەر، کاتێک نەخۆش دەکەون)، تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.**

**تێبینی:** هەندێک لە زانایان لە تەفسیری ئەمەدا: (هُمُ الَّذِينَ لا يَسْتَرْقُونَ) دەڵێن: مەبەست لە ڕوقیەیەکە کە شیرک و هاوبەشی تێدایە بۆ خودای گەورە ئینجا لە کاهینەکان داوا دەکرێت کە ڕوقیەکەیان بۆ بخوێندرێت، هەروەک لە سەردەمی جاهیلیدا دەکرا.

هەندێکیش دەڵێن: بەڵکو واتایەکەی ئەوەیە: داوای ڕوقیە لە کەس ناکەن تا بەسەریاندا بخوێنن، بەڵکو ناچنە لای هیچ کەسێک و تەنها پشت بە خودای گەورە دەبەستن.

بەڵام ئەگەر کەسێک ڕوقیەی بەسەرەخۆیدا خوێند یان بەسەر کەسێکیدا خوێند ئەوە ئاساییە و ناچێتە ژێر واتای ئەم فەرموودەیە، هەروەک پێغەمبەرﷺ ڕوقیەی بەسەرەخۆیدا دەخوێند، وە فەرمانیشی کردووە ڕوقیە بخوێنن.

وە گوێگرتن لەو ڕوقیە شەرعیانەی کە تەسجیلکراون وەکو لە تەلەفۆن و ئامێرەکاندا تۆمار کراون، ئەمەش ئاساییە و ئەم فەرموودەیە نایگرێتەوە، زۆر خەڵک سوودی لێبینیوە، ئەگەرچی واباشترە کەسەکە بەخۆی بخوێنێت.

---

[1] رواه البخاري(٦٤٧٢).

بەڵام كەسێك بچێتە لای يەكێك و داوای لێبكات ڕوقيەی بەسەردا بخوێنێت ئەوە ئەوكات ئەم فەرموودەيە دەيگرێتەوە، بەڵام كردنی دروستە و هيچ ئيشكالی تێدا نييە، تەنها ئەوە نەبێت لە پاداشتی كەم دەبێتەوە و لەوانەيە لەو كەسانە نەبێت كە بەبێ لێپێچينەوە دەچنە بەهەشت. هەر خودا خۆی زاناترە.

ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەيە تا كەسی باوەڕدار تەنها پشت بە خودای گەورە ببەستێت و خۆی ڕوقيە بەسەرەخۆيدا بخوێنێت و بەسەر نەخۆشەكاندا بخوێنێت و زيكر و يادی خودای گەورە زياتر بكات. خودای گەورە لەو كەسانەمان حيساب بكات كە بەبێ لێپێچينەوە دەچنە بەهەشت.

## ڕەوشت جوانی

**٨٩- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {إِنَّ الرَّجلَ لَيُدْرِكُ بِحُسنِ خُلُقِهِ دَرَجاتِ قائِمِ اللَّيلِ، صائِمِ النَّهارِ}[1].

**واتە:** كەسی واهەيە بە هۆی ڕەوشت جوانيەوە دەگاتە پلەی ئەو كەسەی كە بە شەو شەونوێژ دەكات، وە بە ڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت.

## سەردانی كردنی موسڵمان

**٩٠- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {ما مِن مُسْلِمٍ يَعودُ مُسْلمًا غدوةً إلّا صلّى عَلَيْهِ سبعون ألفَ ملَكٍ حتّى يُمسيَ، وإن عاده عشيَّةً إلّا صلّى عليه سبعون ألفَ ملَكٍ حتّى يُصبِحَ، وكان له خريفٌ في الجنَّةِ}[2].

---

[1] السلسلة الصحيحة(٧٩٥).

[2] صحيح الترغيب(٣٤٧٦).

واته: هه‌ر موسڵمانێک سه‌ر له‌ به‌یانیه‌ك سه‌ردانی موسڵمانێكی تر بكات، ئه‌وه حه‌فتا هه‌زار فریشته‌ داوای لێخۆشبوون و دوعای بۆ ده‌كه‌ن تا ئێواره‌ دادێت، وه ئه‌گه‌ر ئێواره‌ سه‌ردانی بكات، ئه‌وه حه‌فتا هه‌زار فریشته‌ داوای لێخۆشبوون و دوعای بۆ ده‌كه‌ن تا به‌یانی دادێت، وه بۆی ده‌بێته‌ باخێک له‌به‌هه‌شت.

## هاوكاری كردنی موسڵمانان

**٩١-** پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رموێت: {ولأنْ أَمْشِي مع أَخٍ لي في حاجَةٍ أحبُّ إِلَيَّ من أنْ اعْتَكِفَ فِي هَذا الْمَسْجِدِ، (يعني مسجدَ المدينةِ) شهرًا}[1].

واته: ئه‌گه‌ر بڕۆم به‌ده‌م پێویستی برایه‌كمه‌وه، خۆشه‌ویستتره‌ له‌لام له‌وه‌ی یه‌ک مانگ ئیعتیكاف بكه‌م له‌م مزگه‌وته‌(واته مزگه‌وتی پێغه‌مبه‌رﷺ له‌ مه‌دینه).

## پله‌ و پایه‌ی شه‌هید

**٩٢-** پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رموێت: {لِلشَّهيدِ عِندَ اللَّهِ سِتُّ خِصَالٍ: يُغْفَرُ لَهُ في أوَّلِ دَفْعَةٍ، وَيَرى مَقْعَدَه مِنَ الجنَّةِ، وَيُجارُ مِن عَذابِ الْقَبرِ، وَيأْمَنُ مِنَ الْفَزَعِ الْأَكْبَرِ، وَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ

[1] السلسلة الصحيحة(٩٠٦).

تَاجُ الْوِقَارِ الْيَاقُوتَةُ مِنْها خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَيُزَوَّجُ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ زَوْجةً مِنَ الْحُورِ العِينِ، ويشفَّعُ في سبعينَ من أقربائِهِ}[(1)].

واتە: شەهید لای خودای گەورە شەش بەهرەی هەیە: لەگەڵ یەکەم دڵۆپە خوێنی کە لێی دەڕژێ خوا لێی خۆشدەبێت، شوێنی خۆی لەبەهەشت نیشان دەدرێت، لە سزای گۆڕ ڕزگاری دەبێت، لە ترس و لەرزی گەورەی ڕۆژی دوایی پارێزراو دەبێت، تاجی ویقارِ و ڕێز دەخرێتە سەر سەری، دەنکە یاقوتێکی ئەو تاجە چاکترە لە هەموو دونیا و ئەوەی کە تێیدایە، حەفتاو دوو حۆری بەهەشتی لێ مارە دەکرێت، تکا و شەفاعەت بۆ حەفتا کەس لە کەس و کاری وەردەگیرێت.

## خێرکردن

**٩٣- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن تَصَدَّقَ بعَدْلِ تَمْرَةٍ مِن كَسْبٍ طَيِّبٍ، ولا يَقْبَلُ اللَّهُ إلّا الطَّيِّبَ، وإنَّ اللَّهَ يَتَقَبَّلُها بيَمِينِهِ، ثُمَّ يُرَبِّيها لِصاحِبِهِ، كما يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، حتّى تَكُونَ مِثْلَ الجَبَلِ }[(2)].

واتە: هەرکەسێك بە ئەندازەی لەتە خورمایەکی حەڵاڵ خێر بکات- کە خوای گەورە جگە لە حەڵاڵ هیچ شتێکی تر وەرناگرێت- ئەوا خوای گەورە بە دەستی ڕاستی وەری دەگرێت و گەورەی دەکات بۆ خاوەنەکەی تا بەئەندازەی شاخێکی لێ دێت، هەروەکو چۆن یەکێك لە ئێوە بێچوە ئەسپەکەی گەورە دەکات.

---

(1) إسناده صحيح، مشكاة المصابيح(٣٧٥٧).

(2) رواه البخاري(١٤١٠).

## سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەرﷺ

**٩٤- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَن صَلّى عَلَيَّ صَلاةً صَلّى اللَّهُ عليه بها عَشْرًا}[1].

**واته: هەركەسێک صەڵاواتێكم لەسەر لێبدات، ئەوە خوداى گەورە بەهۆيەوە دە صەڵاوات لەسەر ئەو كەسە لێدەدات.**

**تێبينى: صەلاوات دانى خوداى گەورە لەسەر بەندەكانى بريتيە لە باسكردن و ستايش كردنيان لە لاى فريشتەكان.**

## بێ دەنگى

**٩٥- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَنْ صَمَتَ نَجَا}[2].

**واته: هەركەسێک بێدەنگ بێت و زمانى بگرێت لە خراپە، ئەوە ڕزگارى بووە.**

**(ڕزگارى بووە لە بەڵاى هەردوو دونيا).**

## پاداشتى نوێژى چێشتەنگاو

**٩٦- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {يُصْبِحُ على كُلِّ سُلامى مِن أحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بالمَعروفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنِ المُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَيُجْزِئُ مِن ذلكَ رَكْعَتانِ يَرْكَعُهُما مِنَ الضُّحى}[3].

---

[1] صحيح الترمذي(٤٨٥).

[2] أخرجه الترمذي (٢٥٠١)، وأحمد (٦٤٨١)، صحيح الترغيب(٢٨٧٤).

[3] روه مسلم(٧٢٠).

واتە: هەرچی جومگەیە کە لە لەشی هەریەکێکتاندا هەیە خێرێکی لەسەرە، وتنی هەر(سبحان الله)یەك خێرێكە، هەر (الحمدلله)یەك خێرێكە، هەر (لا إله إلاالله)یەک خێرێكە، هەر (الله أكبر)ێك خێرێكە، فەرمانكردن بەچاكە خێرێكە، ڕێگری كردن لە خراپە خێرێكە، بەڵام دوو ڕكات نوێژی چێشتەنگاو جێی هەموو ئەمانە دەگرێتەوە.

## پاداشتی زیكری چوونەدەر لە ماڵ

**٩٧-** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {من قال، يعني إذا خرج من بيتِه: "بِسْمِ اللهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلّا بِاللهِ"، يُقالُ له: كُفِيتَ ووُقِيتَ وتنحّى عنه الشَّيطانُ}[1].

واتە: هەركەسێك لەماڵ چووەدەر و وتی(بِسْمِ اللهِ، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ)، پێی دەوترێت: كیفایەت كرایت(واتە: دوور خرایتەوە لە خراپە و خەمی قیامەت)، پارێزرایت( لە شتە پەنهان و خراپەكان و دوژمنەكانت لە شەیتانەكان و جگە لەوانیش) وە شەیتانی لێ دوور دەخرێتەوە.

## ڕێ نیشاندان بۆ كاری چاكە

**٩٨-** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {الدّالُّ عَلَى الْخَيْرِ كَفَاعِلِهِ}[2].

واتە: ڕێ نیشاندەری كاری چاكە، وەک ئەو كەسە وایە كە چاكەكە دەكات.

(واتە كەسێک كارێكی چاكت فێربكات و ئینجا بیكەیت، پاداشتی ئەو كەسەی كە ئەم كارەی فێركردی وەک پاداشتی تۆ وایە).

---

[1] صحيح الجامع(٦٤١٩).

[2] صحيح الجامع(٤٥٥٦).

## فەرموودەی گشتی

**٩٩- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:**{أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ، وَأَرْضَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ، وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ إِعْطَاءِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ، وَمِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ ؟ " قَالُوا : وَمَا ذَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ : ذِكْرُ اللهِ}[1].

**ئایا خێرترین و باشترینی کردەوەکانتان پێ بڵێم، کە زیاتر لە هەموویان جێگای ڕەزامەندی خاوەن و پەروەردگارتانە؟ هۆی بەرزترینی پلەتانە و لە بەخشینی زێڕ و زیو بۆتان باشترە، باشترە بۆتان بگەن بە دوژمن و لەگەردنیان بدەن و لە گەردنتان بدەن؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ جا ئەوە چیە(ئەو پاداشتەی هەیە؟)، فەرمووی: یادی خودای گەورە.**

**١٠٠- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** {مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا ؛ سَتَرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا ؛ سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ ؛ إِلَّا نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ ؛ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ}[2].

---

[1] صحيح، رواه ابن ماجة(٣٧٩٠)، والترمذي(٣٣٧٧)، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب(١٤٩٣).

[2] رواه مسلم(٢٦٩٩).

واتە: هەركەسێك يارمەتی موسڵمانێك بدات بۆ ئەوەی نارەحەتیەكی دونيايی لەسەر لا ببات، ئەوە بێگومان خودای گەورە ناخۆشيەكی ڕۆژی قيامەتی لەسەر لادەبات، هەركەسێك يارمەتی هەژار و نەدارێك بدات و كاری بۆ ئاسان بكات، ئەوە خودای گەورەش كار بۆ ئەو كەسە ئاسان دەكات و يارمەتی دەدات، خودای گەورە لە يارمەتی و كۆمەكی بەندەی خۆيدايە مادام ئەو بەندەيە يارمەتی برای خۆی دەدات و كۆمەكی دەكات، هەركەسێك ڕێگايەك بگرێتە بەر بۆ ئەوەی عيلم و زانست بەدەست بهێنێت، ئەوە خودای گەورە بەهۆی ئەوەوە ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەكات، هەر كۆمەڵێك كۆببنەوە لەماڵێك لەماڵەكانی خودای گەورە و قورئان بخوێننەوە ديراسەی بكەن لەنێوان خۆياندا، ئەوە بێگومان هێمنی و دڵئارامی دادەبەزێتە سەريان، و ڕەحمەت و بەزەيی دايان دەپۆشێت، و فريشتەكانيش چواردەوريان دەگرن و خودای گەورەش باسيان دەكات لای ئەوانەی كە لەلای ئەون(فريشتە بەرزەكان)، هەركەسێك كار و كردەوەی ناتەواو بێت و دوای خستبێت، ئەوا بێگومان نەسەب و بنەماڵە و ڕەچەڵەك فريای ناكەوێت و پێشی ناخات.

١٠١- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَآنِ، أَوْ تَمْلَأُ مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ. وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ. كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَايِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا}[1].

واتە: دەستنوێژ يان پاك و خاوێنی بەشێكی ئيمانە، (الحمدلله) تەرازوو پڕدەكات، (سبحان الله) و (الحمدلله) نێوانی ئاسمانەكان و زەوی پڕ دەكەن، نوێژ نورە و،

[1] رواه مسلم(٢٢٣).

خێرکردنیش ڕاستی ئیمان و گوێڕایەڵی سەلماندنە بۆ خودای گەورە، ئارامگرتن ڕووناکیە بۆت، قورئانیش شایەدیت بۆدەدات یان شایەدیت لەسەر دەدات، خەڵکی بەیانیان زوو دەڕۆن خۆیان دەفرۆشن، بەوەش یان خۆی ڕزگار دەکات(ئەگەر خۆی بفرۆشێتە خودای گەورە) یانیش خۆی تیادەبات(ئەگەر خۆی بفرۆشێتە شەیتان).

**١٠٢-** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: {تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ، وَأَمْرُكَ بِالْمَعْرُوفِ، وَنَهْيُكَ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَإِرْشَادُكَ الرَّجُلَ فِي أَرْضِ الضَّلَالِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَبَصَرُكَ لِلرَّجُلِ الرَّدِيءِ الْبَصَرِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِمَاطَتُكَ الْحَجَرَ، وَالشَّوْكَةَ، وَالْعَظْمَ عَنِ الطَّرِيقِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِفْرَاغُكَ مِنْ دَلْوِكَ فِي دَلْوِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ}[1].

واتە: پێکەنین بەڕووی براکەتەوە سەدەقەیە بۆت، فەرمانکردن بەچاکە سەدەقەیە بۆت، ڕێگری کردن لە خراپە سەدەقەیە بۆت، ڕێ نیشاندانت بۆ کەسێکی ڕێ لێ ونبوو سەدەقەیە بۆت، یارمەتی نابینایەک بدەی سەدەقەیە بۆت، بەردێک یان دڕکێک یان ئێسکێک لەسەر ڕێگا لاببەی سەدەقەیە بۆت، لە دۆڵچەی خۆتەوە ئاو بخەیتە دۆڵچەی براکەتەوە سەدەقەیە بۆت.

[1] جامع الترمذي(١٩٥٦) وصححه الألباني في صحيح الترمذي.

# ناوەڕۆك

